# چەند ڕوونکردنەوەیەک

ئەم پەرتووکە، لە پێنج گوتاری جۆربەجۆر پێکهاتووە، لە چەند ڕووداوێکی ڕامیاریی و مێژوویی هاوچەرخ دەکۆڵێتەوە. زۆربەشیان لە ڕۆژگارێکی نزیکدا ڕوویانداوە. گوتارەکانیش، بەپێی مێژووی نووسینیان ڕیزکراون، واتا زنجیرەی ڕووداوەکان، لە نوێوە بۆ کۆن دەسپێدەکەن.

لە ڕاستیدا، نیازم نەبوو، ئەم چەند گوتارە نوێیە، لە دووتوێی ئەم پەرتووکەدا بڵاوبکەمەوە. چونکە بازاڕی چاپەمەنی کوردیی، گەلێ کز و لاوازە. جگە لەوەی نووسەر، مایەکەی خۆی دەس ناکەوێتەوە، جگە لەوەی زیاندەکا، تووشی گلەیی و ئەرکێکی قورسیش دەبێ.

بەڵام ئەوەی پتر هانیدام، ئەم جارەش هێندێ پوڵ، لە دەمی خۆم بگێڕمەوە، تا ئەم بەرهەمە نوێیەی بێ چاپکەم، ئەم خاڵانەی لای خوارەوە بوون :

1. لەم دواییانەدا، چەند هەواڵێکی نوێ، لە سەرانسەری جیهاندا بڵاوبۆوە، بە جارێ بارودۆخی کوردستان و نێوچەکەی هەژان. لە لایەکەوە، کۆتایی بە جەنگی نێوخۆی چوارساڵەی، نێوان پارتی و یەکێتی هات، پرۆسەی ئاشتیی، لە نێوان بارزانیی و تاڵەبانیدا، لە واشنتۆن مۆرکرا.

لە لایەکی دیکەشەوە، سکرتێری گشتیی P.K.K « عەبدوڵڵا ئۆجەلان »، لە سووریا دوورخرایەوە. کەچی جگە لە چەند نووسەرێ، زۆربەی نووسەرانی کورد، لە ئاستی ئەو دوو ڕوودواوە گرنگەدا، نوزەیان لێوە نەهات، هیچ جۆرە هەڵوێستێکیان دەر نەبڕی و بێدەنگ بوون! دیارە، ئەو جۆرە نووسەرانە، هەمیشە ئامادەن، لە ڕێگای ڕۆژنامە و گۆڤارەکانەوە، سووکایەتیی بە یەکدیی بکەن، گەرمەگوتار دژی لایەنێکی دیاریکراو بنووسن و چاو لە ڕاستییە مێژوویی یەکانیش بنووقێنن، بەڵام لە ئاستی چەند ڕووداوێکی مێژوویی گرنگدا، خۆیام ماتکەن!

2. ئەو مانگنامە و گۆڤارە وەرزییە کوردییانەی، لە دەرەوەی وڵات دەردەچن، زۆربەی جار، بە ئاشکرا، بێ هەڵوێستیی، ترسنۆکیی و وابەستەیی، بە تەوێڵی هێندێ لە دەستەی نووسەرانیانەوە دیارە. کەچی گەر

نووسـەرێ بیـەوێ، کـورتە باسێکی مێـژوویی ڕووداوەکـان، پێشکەش بە خـوێنەران بکا، هەڵەی لایەنە کـوردسـتـانیـیـەکـان ئاشکرابکا، پەند و ئامۆژگارییەکانی لێوە هەڵێنجێ، سانسۆر لە سەر گوتارەکانی دادەنێن، بێ هۆیەکی بەجێ، نووسینەکانی بڵاو ناکەنەوە. بۆ نموونە: گۆڤاری « گزینگ » لە نامـەیەکدا، دەربارەی گـوتارەکـەی « ئۆجەلان »، بۆ نووسەری ئەم چەند دێڕەی نووسیوە:(بە هۆی ناوەڕۆکی ژۆرنالیستیی و شێوازی ئیحساسی، بۆ بڵاوکـردنەوە پەسـەند نەکـرا). دیارە هەر شـتێ بڤـەبێ، دڵی سـەرانی ڕێکخـراوەکـان بیـەشێنێ، دەسـتـەی نووسـەران گۆشـتی کەمـتـەرخەمـیی پێ نەگرن، لە پانیی و درێژیی پێی زیاد نەکەن، بڵاوی ناکەنەوە!

لێرەدا، چەند پرسـیـارێ خـۆی قـووتدەکـاتەوە: ئایا ئەم ڕاسـتـیـیـانەی، لەم بەرهەمـەدا تۆمـاریاندەکـەین، چ زیانێ بە سـەرجـەم بزووتنەوەی کـورد دەگەیەنێ؟ ئایا ئێـمـە هەست و هۆشی سەرکـردەی پارتەکـانی کـوردسـتـان برینداردەکەین، یا کردار و گوفـتارە خراپەکانی ئەوان، وامان لێ دەکەن، ئەم جۆرە گوتارانەیان لە سەر بنووسین؟ ئەدی ئەو سەرکردانە، کاتێ سوکایەتی بە ناو و ناوبانگی خۆیان، ڕێکخراو و نەتەوەکەیان دەکەن، کاتێ ناکۆکیی و دووبەرەکـیی دەنێنەوە، کـاتێ لە پێناوی دەسـەڵات و کـورسـیـدا، فـتـیلەی جەنگی نێـوخۆ هەڵدەگیـرسێنن، کاتێ ناپاکیی لە خاک و هاوزمـانەکـانی خۆیان دەکەن، کـاتێ هانا بۆ سەرانی چوار دەوڵەتەکە دەبەن، پەلی لەشکری دەوڵەتە داگـیـرکـەرەکـان دەگـرن، لە لایەنێکی دیکەی کـوردسـتـانیی دەدەن، کـاتێ دەس و پەنجەیان، بە خـوێنی ڕۆڵەکـانی، ئەم نەتەوە هەژارە چەوسـاوە بندەسـە سووردەکەن، بۆچی دەبێ، ئەو کـارە چەپەڵانەیان باس نەکرێ؟ هەڵە، تاوان و ناپاکییەکانیان بۆ بشاردرێتەوە؟ ڕەخنەی توندیان لێ نەگیرێ؟

3. بڵاوکـراوە کوردییـەکـان، بە شـێـوەیەکی قـووڵ و بابەتانە، لە ڕووداوەکان ناکـۆڵنەوە، تەنیـا لە تەنـکاییـدا پەلدەکوتن. زۆربەی نووسینەکان، خۆیان لە گلەییکردن و پێـشـنیـازکـردندا دەنوێنن. بێ ئەوەی کـورتەیەکی مێـژوویی، هەمـوو ڕووداو و کارەساتەکان، بیری جەمـاوەری نەتەوەکەمان بخەنەوە، بێ ئەوەی، پەند و ئـامـۆژگـاریی پێـویـسـتی لێ وەرگـرن، تا بۆ هەمـوو لایە ڕوونبێتەوە، ئەو کـارەساتانە بۆ ڕوویاندا؟ کەڵک و زیانەکانیان چی بوون؟ کێ قـازانجی لێ کرد و کێ زیانی لێ کەوت؟ ئەو جۆرە لێکۆڵینەوانەش، بە تەواویی تینوێتی جەماوەر ناشکێنن.

4. تا ئێستا، پەنابەرانی کورد لە دەرەوەی وولات، بڵاوکراوەیەکی ڕۆژانەیان نییە، تا کورتەهەواڵ، دەنگوباسی کوردستان و جیهان، گوتارەکانی نووسەران بە شێوەیەکی دیمۆکراسییانە و لە کاتی خۆیدا بڵاوکاتەوە. ئەو مانگنامە و گۆڤارانەی دەریشدەچن، جگە لەوەی هێندێ جار گێلەدەکەن و لەکاتی خۆیاندا، بە ڕێکوپێکی دەرناچن، گەلێ جاری دیکەش، لە ژێر کارتێکردنی ناکۆکیی نێوان نووسەران، ئیرەیی بە یەکدی بردن، ڕقوکینە، تۆڵەکردنەوە و دەستیاودا، تا بینەقاقایانی تێدەنێن. لە هەمان کاتیشدا، ئەو بابەتانەی بڵاویشیدەکەنەوە، تا بە دەس خوێنەران دەگا، بە تەواویی کۆندەبن، هێز و پێزیان لەبەردەبڕێ.
5. ئەز وەک کوردێ، تا لە ژیاندابم، تا دەسم پێنووس بگرێ، تا مێشکم توانای بیرکردنەوەی هەبێ، تا گیرفانم ئاوەدانبێ، بڕیارمداوە، لە ئەرکە نەتەوەیی یەکانی سەرشانم دوانەکەوم، هەرچی ڕاستیی هەیە، بۆ جەماوەری نەتەوەکەمی ئاشکراکەم. جا هەر کەس و لایەنێکی کوردستانیی، بەو ڕاستییانە نیگەراندەبێ، کەشتیی بەرژەوەندییەکانیان، لە زەریای نووسینەکانمدا نقومدەبێ، بە لای منەوە گرنگ نییە. چونکە ڕاستیی و هەق، بە تاکە سەرمایەی ژیانم دەزانم، هەر وەک « مەحوی »یش دەفەرمووێ :
بە حەق هەر حەق، بە ناحەق ناحەقم وتوە لە ڕۆژێ بووم
وەکوو مەنصوور ئەگەر بیشمکوژن ناکەم لە حەق لادەم
بۆیە گەر لەو ڕێگایەشدا، خۆم و پێنووسەکەم گلابن، ئەوا چاوی ڕاستیپەرستان، هەقپەرستان، نیشتمانپەروەران، خوێنەرانی هێژا و کۆمەڵگەی کوردەواریی خۆشبێ!
لەبەر ئەو هەموو هۆیانەی باسمکردن، بڕیارمدا، ئەم چەند گوتارە، لەم پەرتووکە جوانەدا بڵاوبکەمەوە، پێشکەش بە خوێنەرانی هێژای بکەم. هیوادارم کەلێنێکی لە پەرتووخانەی کوردیدا پڕکردبێتەوە، ڕێڕەوی ڕووداوەکانی بە شێوەیەکی بێلایەن و پڕ لە ڕاستیپەرستانە ڕوونکردبێتەوە، لەو ماڵە گەورەیەی مێژووی کوردیشدا، بەردێکمان لە سەر بەردێ دانابێ.

دوکتۆر حوسێن محەممەد عەزیز
ستۆکهۆڵم
1998/01/01

# پێشەکیی چاپی دووەم

سەرەتا دەمەوێ، شتێ بڵێم: ئەم بەرهەمە، هەر زوو لە نێو دڵ و دەروونی، کوردە پەنابەرەکاندا، جێگەی شیاوی تایبەتیی خۆی کردەوە. هەرچەندە، گوتارەکەی « ئۆجەلان »، پێش ڕفاندنی نووسراوە، بەڵام تا ئەوڕۆ، لە یەک پیتی پەشیمان نیم. چونکە وا دەردەکەوێ، نیشانم پێکاوە، بۆچوونەکان ڕاست دەرچوون، ئەو برایانە سوود لە هەڵەکانی خۆیان وەرناگرن!

پاشان دەمەوێ، هەل بقۆزمەوە، چەند شتێ دەربارەی پارتە ڕامیارییەکانی کوردستان و دیمۆکراسیی ڕوونکەمەوە. پارتەکان، دەرگای دیمۆکراسیی بە دوکان و بازاڕێکی تایبەتیی خۆیان دەزانن، هەر کاتێ ئەو دوکان و بازاڕە، قازانجی هەبوو، ئەوا گرنگیی پێ دەدەن. بە پێچەوانەشەوە، گەر زیانیان لێ بینی، ئەوا دوکان و بازاڕەکەیان دادەخەن.

شتێکی سەیرنییە، گەر هەموویان بە ڕواڵەت دیمۆکراسیی بن، بانگاشەی دیمۆکراسیی بکەن، چونکە لە لایەکەوە، دیمۆکراسیی مژدەی سەردەمە و ناوبانگێکی باشی هەیە، ئەوانیش بە هۆی ئەو ناوبانگەوە، خەڵکی بۆ هەڵدەخەڵەتێنن. لە لایەکی دیکەشەوە، لە نێو کۆڕ و کۆمەڵە ڕامیارییەکانی جیهانیشدا، لافوگەزافی دیمۆکراسیی، پێشکەوتنخوازیی و مرۆڤپەروەریی پێوە لێدەدەن. بەڵام سەیر ئەوەیە، گەر نووسەرێ وەک لۆتی، زوڕنایان بۆ بژەنێ، چاو لە کەموکوڕییەکانیان بپۆشێ، ئەوا بە نووسەرێکی گەورەی دادەنێن و ڕێزی لێ دەگرن. کەچی گەر نووسەرێ، ڕەخنەیان لێ بگرێ، هەرچەندە ڕەخنەکەش دروسکەربێ، لە دڵسۆزییەوە بێ، ئەوا بە چاوی دوژمن تەماشایدەکەن. با لێرەدا، چەند نموونەیەکی زیندوو، لە هەڵسوکەوتی ڕێکخراوەکانی « سوید »یان بێنینەوە :

1. پارتی دیمۆکراتی کوردستان، کە ووشەی دووەمی ناوی ڕێکخراوەکەیان، هەر لەو ڕۆژەی دامەزراوە، لە دیمۆکراسیی پێکهاتووە. لەبەرئەوەی ئەز دەربارەی هەنگاوە ناپاکەکانی(1996/08/31) و (1997/05/15)، وەک کوردێکی نەتەوەپەروەر، باوەڕی خۆم دەربڕی و ڕەخنەم لێ گرتن، تا ئێستا هەرچی لە دەسیان هاتووە، درێغییان نەکردوە.

2. یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، لەبەرئەوەی لە پەرتووکی(ڕۆڵی سیستێمی بنەماڵە لە بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا)ڕەخنەم لە

کاره نالەبار و خراپەکانیان گرتووە، ماوەی سێ ساڵێ دەبێ، جگە لەوەی هەموو جۆرە پێوەندییەکی دۆستانەیان لەگەڵدا پچڕاندووم، بەرهەمەکەشیان بە « جنێونامە » لە قەڵەمداوە. بە مەرجێ زۆربەی زۆری ئەو بەرهەمە، بۆ پارتی و بنەماڵەی بارزانیی تەرخانکراوە!

3. P.K.K. تا ڕەخنەم لێ نەگرتبوون، منیان بە دۆستێکی نزیکی خۆیان دادەنا. بەڵام کاتێ لە(1998/01/05)دا، لە «MEDTV »، بەرنامەی « دەنگی گەل »، دەربارەی « جەنگی نێوخۆ » چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵدا کردم، ڕەخنەم لە کردارە توندڕەوەکانیان گرت، لەو ڕۆژەوە بە هیچ جۆری پێوەندییان پێوە نەکردووم. هەروەها، کاتێ لە مانگی (مارسی/1998)دا، لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی « کۆنگرەی نەتەوەیی »، لە شاری ستۆکهۆڵم ڕەخنەم لێ گرتن، جگە لەوەی بە تێلێفۆن ناڕەزایی خۆیان دەربڕی، هەروەها لە تێلێڤیزیۆنی « مەد »یشەوە، تێلێفۆنیان بۆ کردم، گوایە، لەو کۆبوونەوەیەدا « جنێو »م پێ داون! لەبەرئەوە بڕیارمانداوە، چیدیکە وانەکانی « جوگرافیای ڕامیاریی » بڵاونەکەینەوە. هەرچەندە دوایی هەر خۆشیان پەشیمانبوونەوە، بەرنامەکانیان بەگەڕخستەوە، بەڵام ئیدی لەو کاتەوە، لای هەموو لایەکیان، چارەم ڕەشبووە.

لێرەدا زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: کاتێ ڕەخنە لە ڕێکخراوێکی دیاریکراو دەگرم، لەبەرئەوە نییە، شتێکی تایبەتیم دژی ئەو ڕێکخراوە هەبێ، چونکە من وەک کوردێکی بێلایەن، هیچ شتێکم لەگەڵ هیچ لایەکیاندا نییە. یا لەبەرئەوە نییە، تەنیا حەزم لە ڕەخنەگرتن بێ، بەڵکوو بڕیارێکە و داومە، تا ماوم، ئەو ڕێکخراوانە، هەر هەڵەیە، تاوانێ، ناپاکییە بەرانبەر بە ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم و خاکی نیشتمانەکەم بکەن، پێوەندیی بە ئێستا و پاشەڕۆژی نەتەوەکەمەوە هەبێ، زیان بە نیشتمانەکەم بگەیەنێ، هەرگیز بێدەنگ نابم، وەک تا ئێستا بێدەنگ نەبووم. بۆیە بە هیچ شێوەیە ناتوانم، قوقەپی لێ بکەم، چاو بنوقێنم و خۆم کەڕکەم. خۆ گەر کردەوەی ئەو ڕێکخراوانە، تەنیا پێوەندیی بە خۆمەوە بووایە، تەنیا زیانی بە خۆم بگەیاندایە، ئەوا ئەو کاتە، خۆم کەڕ و لاڵ و کوێر دەکرد، وەک چەندین جاری دیکە پشگوێم خستوون. جا با بزانین، بۆ ئەم بەرهەمە نوێیەم چی دەڵێن و چی دەکەن!!!

1999/03/21

# ئاشتیی بە دەنگ نییە،
# بە ڕەنگە!

پێش هەموو شتێ دەبێ، ئەوە بزانین، لە وڵاتە دیمۆکراسییەکاندا نەبێ، لە نێو هیچ ڕێکخراوێکدا، لە هیچ دەوڵەتێکی ئەم جیهانەدا، هەرگیزاوهەرگیز، دوو سەرەگا لە مەنجەڵێکدا، پێکەوە جێگایان نەبۆتەوە و جێگاشیان نابێتەوە.
هەر وەک چەندین جار بە نووسین، لە گفتوگۆی ڕادیۆ و چاوپێکەوتنی تێلێڤیزیۆندا باسمانکردووە، جەنگی نێوخۆی نێوان پارتی و یەکێتی لە باشووری کوردستان، شتێکی نوێ نییە، ڕووداوێکی کتوپڕیی نەبووە و نییە. بەڵکوو لە دووتوێی لاپەڕەکانی دیرۆکی نوێی کورددا، مێژوویەکی ڕەش و چەپەڵی بۆ خۆی تۆمارکردووە. ئەو ناکۆکیی و دووبەرەکییەی ئەوڕۆ دەیبینین، هەر لە یەکەم ڕۆژی دامەزراندنی پارتییەوە سەریهەڵداوە. بە جۆرێ لە جۆرەکان، ناکۆکییەکە لە نێوان ئەندامانی سەرکردایەتی پارتدا هەبووە، چەند جارێ، بە شێوەی جیاجیا تەقیوەتەوە. هێندێ جاریش، بە پلەی جیاواز تاوی سەندووە، لە شێوەی پێکدادانی چەکداریدا خۆی

نواندووه، ڕیزی ڕێکخراوەکەی دوولەتکردووە و خوێنێکی زۆر ڕژاوە. وەک هەمــوو ئەو ناکــۆکــیــی و دووبەرەکــیـــانەی، نێــوان ســەرانی پارت لە ســالی(1952)، ناکــۆکــیی نێوان ســەرۆک بارزانیی و هەمــزە عــەبدوللا لە سالی(1959) و دووبەرەکیی نێوان سەرۆک بارزانیی و بالەکەی پەلیتبیرۆ لە سالی(1964)دا ڕوویدا. ئەوەبوو، دوا جاریان بە ناپاکیی و کارەساتێکی نەتەوەیی گەورە کۆتاییپێهات. دەتوانین، بلێین : چەندین سال پارتی، وەک ڕێکخراوێ لاوازکرد، بزووتنەوە چەکدارییەکەی(11/سێپتێمبەری)، وەک شۆڕشێ کرمـۆلکرد.،خەلکی باشووری کـوردسـتـانـیـشی، وەک گـەلێکی سەربەخۆ دواخست، فێری جەنگی کوردکوژیی و ناپاکیی کرد. چونکە گەر دووبەرەکیی و جەنگی نێوخۆ نەبووایە، هەلبەتە، سەرانی ڕێکخراوەکان، هەر لە سـالی(1966)ەوە تا ئەوڕۆ، شانۆگەرییە گالتەجارییە مێژوویی یەکـەی، مـیـرنشـیـنی باباتیـان دووبارەنەدەکـردەوە، هەر جـارەی بە نۆرە، لایەکیان لەشکری عەرەب، فارس و تورکیان، بۆ سەر یەکدی نەدەهێنا!

بەلام زۆر بە داخەوە، سەرانی کورد، نەک هەر پەندیان لە هەلەکانی مێژووی کـۆنی کورد وەرنەگرت، بەلکوو ئەو هەمـوو هەلە، ناکۆکـیی، دووبەرەکـیی، تاوان و ناپاکییانەشیان، بە خراپترین شێوە، لە سالەکانی(1977-1987) دا، لە شۆڕشی نوێی گەلی باشووری کوردستاندا دووبارەکردەوە. دە سالی ڕێک سـەرانی پارتی و یەکـێتی، دوژمنی داگـیرکـەری دەولەتی عـێـراقـیـان پشـکوێخستبوو، مندالی کوردیان بە دەسی یەکدی بە کوشتدەدا.

هەروەها، لە دوای ئەوەی ڕاپەڕینەکـەش ڕوویدا، پەرلەمـانی کـوردسـتـان هەلبـژێررا، مـیـریی هەرێم دامـەزرا، خـەلکی ڕەشـوڕووتی کـورد، ئاهێکـیـان پێداهاتەوە، وایاندەزانی، سـەرانی کـورد، کـەلکـیـان لەو ئەزموونە تالانەی پێشـوو وەرگـرتووە، ئیـدی جـەنگی کـوردڤـڕان هەلناگـیـرسێننەوە، وەک برا پێکەوە فـەرمـانڕەوایی کـوردسـتـان دەکـەن، نیـشـتـمـانە هەژارە بێکەسـە زامدارەکـەمـان دەبووژێننەوە، لایە بە لای مندالانی هەتیـوی باوککوژراو و بێوەژنانی مێردکوژراودا دەکەنەوە. هەولدەدەن، هەموو ژان و ئازارێ، لە بیر ڕۆلەکـانی گـەلەکـەمـان بەرنەوە، دلنەوایی دایک و باوکی شـەهیـدانی کـورد دەکەن. کەچی، ئەم سەرکردە چنگسوورە کوردکوژانە، هیچ لە مێژووی پڕ لە

شەرمەزاریی، ئەو چەند ساڵە فێرنەبوون! لە ڕۆژی(01/مای/1994)دا، جەنگێکی سەرتاسەریی ماڵوێرانکەرانەی چەپەڵیان بەرپاکرد، کەم سوچ و قوژبن مابوو، کەم بن دار و بەردی، باشووری کوردستان مابوو، بە خوێنی ڕۆڵەکانی ئەم گەلە هەژارە، سووریان نەکردبێ!
لە ڕاستیدا، حەزمدەکرد، سەرانی کورد هێندە ژیربوونایە، نەک هەر لە سەر دەسەڵات شەڕیان نەکردایە، بەڵکوو هەرگیز، دڵی منداڵێکی کوردیان ئازارنەدایە، مێروولەیەکی وڵاتەکەیان پاننەکردایەتەوە و لقێ داری سەوزیشیان نەشکاندایەتەوە. بەڵام، هەر وەک جەنگەکەشیان دامەزران، دوای چوار ساڵ کوردکوژیی، گەلێ ئاواتەخوازبووم، بیرێکیان لە باری نالەباری نیشتمانەکەیان و خەڵکی چەوساوەی بێچارەی کورد بکردایەتەوە. هەر هیچ نەبووایە، لایەکیان دەستپێشکەریی بکردایە، وازی لەو کەللەڕەقیی، دڵڕەشیی، ڕقوکینە، پاوەنخوازیی، مەزنخوازیی و کەڵکەڵەی دەسەڵاتە بێنایە.-لە کوێرەدێیەکی کوردستان کۆببونایەتەوە، وەک دوو برا، ڕازوگلەییەکانی خۆیان لە یەکدی بکردایە، ڕەخنەی توندوتیژیان لە یەکدی بگرتایە. پاشان، باوەشیان بۆ یەکدی بکردایەتەوە، دەستی برایەتییان لە ملی یەکدی بکردایە، بەڵێنیان بۆ ڕۆڵەکانی، ئەم گەلە دڵسۆزە نوێ بکردایەتەوە، کە جارێکی دی، کوڕی کورد بە دەستی کورد بەکوشتنادەن، هەرچی گرفتێکی رامیاریی، ئابووریی، ڕاگەیاندن و دەسەڵات هەیە، بە شێوەیەکی دیمۆکراسیانە چارەسەردەکەن. نەک پەنا بۆ بەر هێز و دەسەڵات بەرن، چەکی سووک و قورس بەکاربێنن، ئەو چەکانەی تا ئێستا، دژی سوپای داگیرکەری دەوڵەتی عێراق، بەکاریاننەهێناوە! لەو باوەڕەدام، هەر لایەک ئەم کارەی بکردایە، لای ڕۆڵەکانی گەلەکەمان، جێگای ڕێز و ستاییش دەبوو. چونکە لە مێژە گوتوومانە: هەر لایەنێکیان مل بۆ داواکارییەکانی لایەنەکەی دی بدا، بە دڵ و بە گیان هەوڵ بۆ ئاشتیی بدا، ئەوا هیچ کاتێ ئەوە ناگەیەنێ، ئەو لایەنە لە بەر لاوازیی و بێدەسەڵاتیی، ئەو کارە بە ئەنجامدەگەیەنێ، بەڵکوو گەر لە دڵسۆزیشەوە نەبووایە، جەماوەر هەر بە دڵسۆزیی بۆی دەژمارد. چونکە ئەو لایەنە، بەو کارەی، ئاوێکی بە ئاگری ئەگریسی ئەو جەنگە گلاوەدا دەکرد.

هێندێ کەس هەن، ئەم سەردانەی بارزانیی و تالەبانیی بۆ واشنتۆن، بە دەسکەوت و سەرکەوتنێکی مەزن دەزانن. بەڵێ ڕاستە، چونکە لە لایەکەوە کێشەی کوردی زیندووکردەوە، هێندەی دی جوڵاندیی و بەرەوپێشەوەی برد. کاربەدەسانی دەوڵەتی ئەمەریکا، بەڵێنیان بە سەرکردەی هەر دوو ڕێکخراوەکە دا، گەلی باشووری کوردستان، لە مەترسی هێرشی دڕندانەی، سوپای دەوڵەتی داگیرکەری عێراق بپارێزن، لە دەس کیمیاباران و ئەنفالکردن قووتاریکەن. نەخشەیەکیان بۆ چەسپاندنی ئاشتیی، نێوان ئەو دوو ڕێکخراوە کێشا و ڕەنگیان ڕشت. گەر خاڵەکانی ڕێککەوتننامەکە، لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا جێبەجێبکرێ، ئەوا لە ڕووی ڕامیاریی و دیپلۆماسیشەوە، گەلێ کەڵکی دەبێ. چ لە ناوەوە و چ لە دەرەوەی وڵات، کار و باری کورد، بەرەو باشتر دەبا.

بەڵام لە لایەکی دیکەوە، گەر بە وردیی بیری لێ بکەینەوە، دەبینین، بە تراژیدیایەکی مێژوویی نەتەوەیی بێ وێنە دادەنرێ. چونکە سەرکردەی هەر دوو ڕێکخراوە شەڕکەرەکە، هەرچی جلە چڵکنەکانی خۆیان هەبوو، لە سەر شووشەی تیلیڤیزیۆنی دەوڵەتەکانی جیهان، بە تەنافی ئەمەریکادا هەڵیانواسی. گەلانی جیهانیان لێ تێکەیاندین، کە کورد نەتەوەیەکە، بە ڕاستیی دواکەوتوو، ناکۆک و ناتەبایە. دوای ئەو هەموو تراژیدیایانەی، گەلی باشووری کوردستان بینیوویانە، دوای ئەو هەموو ژان و ئازارانەی چێشتوویانە، کوردەکان ناتوانن، فەرمانڕەوایی خۆیان بکەن، لە نێوخۆیاندا ڕێکناکەون، پارتەکان لە سەر کۆنتڕۆڵکردنی کوردستان، سەرکردەکانیش لە بەر کورسیی و پلەوپایە، هێندەی دی نیشتمانەکەیان وێراندەکەن، ڕۆڵەکانی گەل بە دەسی یەکدی بەکوشتدەدەن. بە ڕاستیی ئەمە بە گاڵتەجاڕیی و شەرمەزارییەکی گەورە لە قەڵەمدەدرێ!

جگە لەوانەش، ئێمە دەمانویست، هەردوو سەرکردە، بۆ باسکردنی کێشەی کورد، ئەو گەشتەیان بکردایە، بۆ بڕیاردانی چارەنووسی گەلی باشووری کوردستان هەوڵیانبدایە، بۆ چەسپاندنی سیستێمە فیدراڵییە جوانەمەرگەکە خەباتیانبکردایە، بۆ مسۆگەرکردنی ژیانێکی پڕ لە ئازادیی و ئاشتیی بکۆشانایە. ئەمەریکا وەک چۆن هەوڵیداوە و هەوڵیشدەدا، ناوبژیی لە

نێوان سەرکردەکانی، گەلی فەلەستین و دەوڵەتی ئیسرایلدا بکا، وەک چۆن خۆی ماندووکردووە و خۆشی ماندوودەکا، ئاشتیی لە نیشتمانی هەر دوو گەلی عەرەبی فەلەستین و جوودا بچەسپێنێ، وەک چۆن دوێنێ، (یاسر عەرەفات و ئیسحاق رابین)ی ئاشتکردەوە، وەک چۆن ئەوڕۆش(یاسر عەرەفات و بنیامین نەتانیاهۆ)ی بە یەکگەیاند، ئێمەش، وەک ڕۆڵەی گەلێکی مافخوراو و بندەس، حەزماندەکرد، دەوڵەتێکی زلهێزی بە توانای وەک ئەمێریکا، سەرانی کورد و دەوڵەتی داگیرکەری عێراق ڕێکبخا، کۆتایی بە کێشەی جەنگ لە کوردستان و نائارامیی لە نێو کورددا بهێنێ، مافە ڕەواکانی گەلی باشووری کوردستان دەسەبەربکا.
جگە لەو شتانەی ئاماژەشمان بۆ کردن، ئەز پڕ بە دڵ دەمخواست، ئەو ڕێککەوتنە لە گوندێکی کوردستاندا بووایە. بارزانیی و تاڵەبانیی، بە هەموو باوەڕێکەوە، باوەشی برایەتییان بۆ یەکدی بکردایەتەوە، بە هەر دوو ڕێکخراوەکە، بە هەر دوو سەرکردە هەوڵیانبدایە، کوردستان ببوژێننەوە، ڕۆڵەکانی گەلیش، لەو مەترسیی، دڵەڕاوکە، بێکاریی و برسێتییە ڕزگاربکەن. نەک لە ناچاریدا، ملی ڕێگای ئەمێریکا بگرنەبەر! جا گەر وا نەبووایە، هەڵبەتە، بارزانیی و تاڵەبانیی، ڕۆژێ لە ڕۆژان، لە ماوەی ئەم سێ ساڵەی دوایی جەنگی نێوخۆدا، تەنیا جارێ پێکەوە لە کوردستان کۆدەبوونەوە! یا کاتێ لە تێلیڤیزیۆندا دەرکەوتن، شەپۆلی ڕقێکی قووڵی بێسنوور، لە زەریای چاوەکانی بارزانییدا نەدەبینرا، هەڵەشەیی و شپرزەییەکی زۆر، بە هەڵسوکەوتی تاڵەبانییەوە دیارنەدەبوو! یا لە چاوپێکەوتنە تێلیڤیزیۆنییەکەی(MBC)دا، پێکەوە دادەنیشتن! بەڵام جگە لەوەی بە شێوەیەکی گشتیی، کورد لەو ئاشتییە قازانجدەکا، هەڵبەتە دیارە، یەکێتی لە چاو پارتیدا، کەڵکێکی زۆر لەو ڕێککەوتنە وەردەگرێ، چونکە هەموو فاکتەرە رامیاریی، سەربازیی، ئابووریی، پێوەندییە نێوخۆیی و نێوچەیی و نێونەتەوەیی یەکانیش، لە بەرژەوەندیی پارتیدا بوون، بۆیە بەو شێوەیە ڕەفتاریاندەکرد!
هەرچی لە ڕێککەوتننامەکەی واشنتۆندا هاتووە، تەنانەت گەر تەنیا هەنگاوێ، ئەو دوو لا شەرکەرە لە یەکدی نزیکبکاتەوە، ئاشتیی لە

کوردستاندا بچەسپێنێ، ئەوا هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر دەبێ، بە دڵ و بە گیان پشگیرییبکا. هەرچەندە بەپێی ڕێککەوتنەکەبێ، ئاشتیی بۆ بەشێکی نیشتمانەکەمان دەگەڕێتەوە، بەڵام دوورنییە، خوێنێکی زۆر لە چەند بەشێکی دیکەی کوردستاندا بڕێژرێ! بۆیە گەر، لە بەر ڕۆشنایی بەرژەوندیی نەتەوەکەماندا، سەرنجێکی سەرپێیی لە هێندێ خاڵی ڕێککەوتننامەکە بدەین، ئەوا چەند شتێکمان بۆ ڕووندەبێتەوە :

1. ئەم ڕێککەوتننامەیە، وەک خاتوو « ئۆلبرایت »، شالیاری دەرەوەی ئەمێریکا گوتی : هەر هەمان ڕێککەوتننامە کۆنەکەی ساڵی(1996)ی ئەنقرەیە و سەرلەنوێ داڕێژراوەتەوە.

2. بەشێکی ڕێککەوتننامەکە، بۆ دژایەتیکردنی P.K.K. تەرخانکراوە. پوختەکەی دەڵێ :

(هەر دوو پارتەکە پێکەوە هاوکارییدەکەن، پارێزگاریی ئاسایشی سنوورەکانی تورکیا و ئێران دەکەن. کۆنترۆڵی ڕێگاوبانەکان دەکەن، تا تیرۆریستەکان لەو سنوورانەدا جموجۆڵنەکەن و سنوور نەبەزێنن. هەر دوو پارتەکە پەیاندەدەن، لە هەر ناوچەیەکی کوردستانی عێراقدا، شوێنی حەوانەوە بۆ ئەندامانی P.K.K. دابیننەکەن. جەخت لە سەر ئەوە دەکەن، هیچ بنکەیەکی P.K.K، لە باکووری عێراقدا نەمێنێ. هەروەها ڕێگە لە شێواندنی ئارامیی و ئاسایش لە نێوچەکەدا و بەزاندنی سنووری تورکیا دەگرن.)«16» کەچی، ڕێککەوتننامەکە بە هیچ شێوەیە، لە دەستدرێژیی هەر دوو دەوڵەتی داگیرکەری تورکیا و ئێران، بۆ سەر کوردستان نەدواوە!

هەر کوردێکی خوێندەوار، کەمێ بە وردیی، سەرنجی سەرتاپای خاڵەکان بە گشتیی، ئەو چەند دێڕەی سەرەوە بە تایبەتیی بدا، یەکسەر بۆی دەردەکەوێ، جگە لەوەی هەر دوولای شەڕکەر ئاشتدەکاتەوە، پارێزگاریی کورد لە باشووری کوردستاندا دەکا، لە ڕووی ڕامیارییەوە، هیچ جۆرە مژدەیەکی خۆش و نوێی، بۆ گەلی باشووری کوردستان تێدانییە. لێرەدا زۆر بە ڕوونی دیارە، چ ئەمێریکا و چ تورکیا، چ پارتی و چ یەکێتی، هەموو لایەکیان لە سەر ئەوە ڕێککەوتوون، گەر پێویست بکا، هێزەکانی تورک بۆی هەیە، سنووری نێودەوڵەتیی عێراق ببەزێنێ، بە دوای

گریلاکانی P.K.K.دا بگەڕێ و پەلاماریانبدا. ئەمەش هەر خۆی لە خۆیدا، لە لایەکەوە، بە یەکێ لە ناوەڕۆکی ئەو خالآنەی، ڕێککەوتننامە کۆنەکانی نێوان تورکیا و عێراق دادەنرێ، کە کاتی خۆی لە سەرەتای هەشتاکاندا، لە نێوان هەر دوو دەولەتی داگیرکەردا مۆرکرا. لە لایەکی دیکەشەوە، هەر هەمان ڕێککەوتننامەیە، کە چەندین جار سەرانی تورک، بە سەر سەرکردایەتی پارتی و یەکێتییاندا سەپاند. واتا لێرەدا دەتوانین، زۆر بە ڕاشکاویی بلێین: ئەوەی تەوەری ئەمێریکا، تورکیا و ئیسرایل، لە نێوچەکەدا دەیانەوێ، بە تەواویی بە سەر پارتی و یەکێتیدا سەپاندوویانە. جا گەر ئەمە بۆ دوارۆژ، جێگای مەترسیی نەبێ، ئیدی دەبێ، لەوە زیاتر مەترسیی چی بێ؟!!

ئەوا سیوحەوت سالی ڕێکە، کوردی پارچەکانی دیکەی کوردستان، لە پێناوی شۆڕشی باشووردا، بە هەموو شێوەیە، قوربانیی بە دەسکەوتەکانی خۆیان دەدەن، بە سەدانیان لێ دەکوژرێ، مالیان وێراندەبێ، بە مەرجێ شۆڕشی باشوور، هەر لە سەرەتاوە تا ئەوڕۆ، لە زیان زیاتر، چ سوودێکی بە ئەوەی کورد نەگەیاندووە، نازانم، بۆ دەبێ، بەو شێوەیە چاکەیان بدرێتەوە؟ ئایا ئەوانیش وەک کوردی باشوور، بە دەس ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە ناچەوسێندرێنەوە؟ ئایا ئەوان، لە نێو ئاو و هەوای سازگاری بەهەشتی پانوبەرینی تورکیا و ئێراندا دەژین، ئەمانیش لە نێو ژیلەمۆی دۆزەخی تەنگەبەری عێراقدا دەبرژێن؟ ئایا ئەوان داگیرکەرەکانیان، نوێژ لە سەر دامێنی فریشتە دەکەن، ئەمانیش داگیرکەرەکەیان، نوێژ لە سەر دامێنی ئەهریمەن دەکا؟ هەلبەتە گەر وا بێ، مالی داگیرکەران، بانێکە و دوو هەوا!

کاتێ گوێمان لێ دەبێ، ئەندامانی پارتی و یەکێتی، پڕوپاگەندە بۆ ڕێککەوتنەکە دەکەن، بە یەک ساز و ئاواز، گۆرانیی بۆ دەچڕن، کەسێ شارەزانەبێ، وا دەزانێ، سەرکەوتنێکی مەزنیان بە دەسهێناوە. بەلام لە ڕاستیدا، هەر ئەوەیە، لە سەرەتاوە لە کوێوە دەسیانپێکردووە، پاش چوار سال جەنگی نێوخۆ، بۆ هەمان جێگا گەڕاونەتەوە، بەلکوو خراپتریش بووە، چونکە باری ئاسایش و هێمنیی کوردستانیان، بە تەواویی تێکداوە، هەلە مێژوویی یەکەیان، لە کیس کورد داوە، بە هەزاران کوڕی کوردیان بە

کوشتـداوه. بۆیه دەبێ، سەرلەنوێ له نووکەوه دەسپێبکەنەوه، واتا گەر هەنگاوێکیان بۆ پێشەوه نابێ، دوو هەنگاو بۆ دواوه گەڕاونەتەوه.
ئێمه له کاتێکدا، پڕ به دڵ پشگیریی پرۆسەی ئاشتیی دەکەین، له هەمان کاتیشدا دەمانەوێ، چاوێ به ڕووداوەکانی ڕابردوویەکی نزیکی گەلەکەماندا بخشێنینەوه. له لایەکەوه، بۆ ئەوەی بزانین، دوێنێ چی ڕوویداوه؟ له پێناوی چیدا، ئەو جەنگه چەپەڵه خۆکوژییه هەڵگیرسا و چوار دانه ساڵی ڕەبەق، بەردەوامبوو؟ له لایەکی دیکەشەوه، تا به تەواویی ڕێز له ئاشتیی بگرین و نرخی بزانین.
ئێمه نابێ، هەرگیز ئەوەمان له یادبچێ، له ماوەی ئەم چوار ساڵەی جەنگیدا، هێندەی کوڕی ئازا و ڕۆژی تەنگانه کوژران، هێندەی کادیری ڕامیاریی و سەربازیی، گیانیان لەدەسدا، دەوڵەتی داگیرکەری عێراق، له ماوەی چل ساڵدا، هێندەی بۆ نەدەکوژرا. هێندەی خوێنڕژێندرا، دوورنییه، بۆ ڕزگارکردنی کەرکوک و ناوچەکانی دیکەی بندەسی عێراق، شتێ کەمتر یا هەر هێندەی خوێن بویستایه. هێندەی گوند و شارۆچکەکانی کوردستان وێرانکرانەوه، هێندەی ڕۆڵەکانی گەل دەربەدەری وولاتان بوون، هێندەی بێپەوشتیی، بێکاریی و برسێتیی له کوردستان بڵاوبۆوه، هێندەی دەزگا سیخوڕییەکانی، هەر چوار دەوڵەته داگیرکەرەکه، له شارەکانی کوردستان تەراتێنیاندەکرد، هێلانەی سیخوڕییان دادەمەزراند، گەرای ناکۆکیی، دووبەرەکیی و ناپاکییان دەخست، هێنده دەوڵەته داگیرکەرەکه، بەو هەموو دڕندەییەی خۆیەوه، له هەڵەکسەمادانەبوو.
به کورتییەکەی، هەرچی بەعسی فاشیست، له ماوەی دەسەڵاتیدا فریانەکەوت، دژی خەڵکی کوردستان جێبەجێیبکا، ئەو دوو ڕێکخراوه لەم ماوەیەدا، به زیادەوه بۆیان تەواوکرد. کەواتا ئێستا بۆمان هەیه، ڕووی دەمان، له هەر دوو ڕێکخراوی شەڕکەر بکەین، له ئەندامانی سەرکردایەتی ئەو دوو ڕێکخراوه به گشتیی و بارزانیی و تاڵەبانیی به تایبەتیی بپرسین، ئەو هەموو خوێنه کوردییه، له پێناوی چیدا ڕژێندرا؟!! داوای خوێن و گیانی، ئەو ڕۆڵه قارەمانانەی گەلەکەمان له کێ بکەین؟!!
ئێمه لەم ڕۆژه ناسکەدا، بۆیه ئەم شتانه باسدەکەین، بۆیه ئەم پرسیارانه،

ئاراستەی جەماوەر دەکەین، بۆیە یەخەی سەرکردەی ڕێکخراوەکان دەگرین، بۆیە قەتماغەی ئەم برینە سەختانە هەڵدەکەنین و زامەکان دەکولێنینەوە، تا جارێکی دی، ئەو کارەساتە نەتەوەیی یە ترسناکانە، چەند بارە نەبنەوە، تا سەرانی ئەو دوو ڕێکخراوە، پەندێ لە مێژووی پڕ لە شەرەمزاریی و لە خوێنهەڵکێشراومان وەرگرن، تا ئەوەی ماوە و لە دەسنەچووە، بە هەموومان قووتاریکەین. بەڵێ، نابێ هەرگیز ناخۆشیی و کارەساتەکانی جەنگی نێوخۆمان بیرچێتەوە. هەڵبەتە هەموو کاتێ دەبێ، لە ڕۆژانی خۆشیی، سەرکەوتن و ئاشتیدا، ناخۆشیی و کارەساتەکانمان لە یادنەچێ و بیری خۆمانی بێنینەوە، تا خۆشیی و سەرکەوتنەکانمان لێ تێکنەچێ. لە هەمان کاتیشدا دەبێ، لە ڕۆژانی ناخۆشیی و تەنگانەدا، هەرگیز ورە بەرنەدەین، ڕەشبین نەبین، بۆ ئاسۆیەکی گەش و پرشنگدار بڕوانین، ڕۆژی سەرکەوتن و سەربەرزیمان لە پێش چاوبێ، بۆ ئەوەی بە سەر ناخۆشیی و گرفتەکاندا سەرکەوین. لەگەڵ ئەوەشدا نابێ، هێندەش باسی ناخۆشییە. بکەی[illegible]ەرەی ڕۆڵەکانی گەل بڕوخێنین. بۆیە دەبێ، لە ئاشتیدا ڕۆژە سەختەکانی جەنگمان لە یادبێ، لە کاتی جەنگیشدا، ئاشتیی باوەڕ و هیوامان بێ!

هەر چەندە لە یەکەم ڕۆژەوە گوتوومانە، ئاگری ئەو جەنگە نارەوایەی، لە نێوان پارتی و یەکێتیدا هەڵگیرسا، لە مێژووی نوێی گەلەکەماندا، کارەساتێکی نەتەوەیی مەزنبوو، ناپاکییەکی گەورەبوو. بەڵام پێویستە، بە هەر شێوەیەبێ، کۆتاییپێبهێنرێ. هەر لە سەرەتاشەوە دەمانزانی، جگە لە ئاشتبوونەوەی گشتیی و دیمۆکراتیزەکردنی کوردستان، هیچ جۆرە چارسەرێکی دیکە نەبووە و نییە و نابێ. هەروەها دەمانزانی، ئەم فیلمەی ئەم جارەی جەنگی نێوخۆی، نێوان پارتی و یەکێتیش، هەر لە سەر حسێبی، خوێنی گەشی ڕەشوڕووتی ڕۆڵەکانی گەل تەواودەبێ، سەرکردەی هەر دوو ڕێکخراوەکەش، وەک کورە ئازاکانی فیلم، پێستی خۆیان ڕزگاردەکەن، وەک پاڵەوانەکانی چیرۆک، بە ساغی بۆی دەردەچن. ئەو کوردە بێلایەنە نیشتمانپەروەر و دڵسۆزانەی، هەر لە یەکەم ڕۆژی جەنگەکەشەوە، دژی ڕەفتار و گوفتاری شەڕخوازان بوون، هەمیشە هەوڵیان بۆ ئاشتیی داوە، لە کۆتاییدا، وەک گێرەشێوێن و ئاژاوەچیی نێوزەددەکرێن، وەک ناپاکیی فیلم

و چیرۆک باسدەکرێن! هەلپەرستەکانیش، ئەوانەی بە شێوەیە لە شێوەکان، پشکیریی لایەنێکیان دەکرد، دژی لایەنەکەی دی دەدوان، پروپاگەند ی خراپ و درۆیان بلاودەکردەوە، جنێوی پیسیان دەدا، ئەورۆ جارێکی دی هەوڵدەدەن، بەپێی بەرژەوەندیی تایبەتیی تاکەکەسیی خۆیان، گوڵەبەرۆژە ئاسا، لەگەڵ خۆری بارودۆخی پرۆسێسی ئاشتییەکەدا، خۆیان بگونجێنن.
بە لای منەوە، شتێکی زۆر سەیرنییە، ئەو دەمە بۆگەنانەی تا دوێنێ بو ێ، فوویان لە گڕی ئاگری جەنگی نێوخۆ دەکرد، کەچی ئەورۆش گولاوپرژێنی ئاشتیی بکەن! لە رادیۆ و تێلێڤیزیۆنەکاندا، وتووێژیان لەگەڵدا دەکەن، لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا، بە گوتارنووسین پێشبرکێ لە سەر ئاشتیی دەکەن!
بەلام هەرچی چۆنێ بێ؛ دەبێ، هەموومان کار بۆ ئاشتیی بکەین، چونکە تەنیا هەر بە ئاشتیی، برایەتیی، تەبایی و یەکێتیی، ریزە لێکدابراوەکانی گەل یەکدەگرنەوە، زامەکان سارێژدەبن، رۆڵەکانی گەل، بە وورەیەکی بەرز و پتەوی پۆلاییینەوە، بە هێز و توانایەکی مەزنیەوە، بەرەنگاری نەخشە و پیلانە گلاوەکانی، دوژمنانی نێوخۆ و داگیرکەران دەبنەوە، وەک قەلایەکی قایم، بە رووباندا رادەوەستن، کورد لە مەترسیی چەوساندنەوە رزگاردەبێ، وردەوردە پێشدەکەوێ، دوژمنانی نێوخۆ و داگیرکەرانیش تێکدەشکێن.
لێرەدا با بزانین، دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستان، دوێنێ چییان دەکرد و ئەورۆش چی دەکەن؟ هەموومان دەزانین، کاتێ بەرەی کوردستانیی هەبوو، پارتی و یەکێتی رێکبوون. دواتر جەماوەری چەوساوەی کورد راپەڕی، هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەش، لەوە دەترسان، نەبا راپەڕینەکە، ئامانجەکانی خۆی بە تەواویی بەدیبهێنێ. نەبا دەوڵەتێکی کوردیی، لە باشووری کوردستان دابمەزرێ. نەبا مەترسیی راپەڕین، بۆ بەشەکانی دیکەی، کوردستانی بندەستی خۆشیان بتەنێتەوە. نەبا نەتەوەی کورد، لە هەموو بەشەکانی کوردستان، دژی داگیرکەر راپەڕێ، داوای مافی سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی ناسیۆنالی تایبەتیی بکا. بەلام هەیهوو، ئاش لە خەیاڵێ بوو، ئاشەوانیش لە خەیالێکی دیکەدا بوو!
ئەوەبوو، کاتێ راپەڕینەکەش سەرکوتکرا، ئەو مەترسییە لە بەردەم دەوڵەتە داگیرکەرەکاندا نەما، ئیدی ئەو ترسەیان نەما. کەچی کاتێ، پەرلەمانی

کوردستان هەڵبژێردرا، دەزگاکانی میریی هەرێم دامەزرا، ئەم جارەش هەر چوار دەوڵەتەکە، دەسیان بە جرتوفرتکردەوە. بە شێوەیەکی ئاشکرا و بە تایبەتییش، هەر سێ دەوڵەتەکەی تورکیا، ئێران و سووریا، هەر شەش مانگ جارێ، لە یەکێ لە پێتەختەکانی ئەو سێ دەوڵەتە داگیرکەرە کۆدەبوونەوە. بە ڕاشکاویی، دژی سیستێمی فیدرالی و پەرلەمانی کوردستان، نەخشە و پیلانیان دادەنا. کۆنەجاش، دوژمنانی نێوخۆ و ناپاکەکانی کوردیشیان، بە پارە دەکری، ڕایاندەسپاردن، لە شارەکانی کوردستان خەڵکی بترسێنن، دزی بکەن، لە شوێنە قەرەباڵغەکان، بۆمبا و ئۆتۆمۆبیل بتەقێننەوە. بەڵام کاتێ جەنگی نێوخۆ دەسپێکرد و بە تەواویی گەرمبوو، ئەوانیش وازیان لەو پێککەیشتنانە هێنا، ئەو کۆبوونەوانە ڕاوەستێنران. ئینجا سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکان، زۆر بە دڵخۆشیی و بە وردیی، سەرنجی جەنگەکەیان دەدا، لە دوورەوە جڵەوی ئەسپی سەرکێشی جەنگەکەیان ڕادەکێشا، بە شێوەیە لە شێوەکان، هەر دەوڵەتێ لەو دەوڵەتە داگیرکەرانە، یارمەتی لایەنێکی شەرکەریان دەدا، تا دەیانتوانی، پتر بەنزینیان بە ئاگری جەنگەکەی نێوان پارتی و یەکێتیدا دەکرد.
دیارە ناهەقیشیان نەبوو، ئەو کارە بکەن، چونکە کاتێ سەرانی پارتی و یەکێتی، نەخشە و پیلانە گڵاوەکانی ئەوانیان پیادەدەکرد. ئیدی بۆچی و لە پێناوی چیدا، کۆبوونەوە بکەن؟ ئەدی کورد دەبێ، لەوە زیاتر چیدیکە لە دوژمنان و داگیرکەرانی نیشتمانەکەی چاوەڕێبکا؟!! جا ئێستاش، کە ناوی پرۆسێسی ئاشتیی لە ئارادایە، بارزانیی و تاڵەبانیی، بە سەرپەرشتیی کاربەدەسانی واشنتۆن کۆبوونەتەوە، دوورنییە، جارێکی دی ئەو کۆبوونەوە سێقۆڵیانە دەسپێبکاتەوە، گەر ئەم جارە چوارقۆڵیش نەبێ و عێراقیش بە ئاشکرا بەشداریی تێدابکا! بۆیە هەر لە یەکەم ڕۆژی دانیشتنەکەوە، تورکیا، هاواری لێ هەستا، بە پەلە نوێنەری بۆ بەغدا نارد، پێوەندیی دیپلۆماسیی، بۆ سەردەمی پێش جەنگ گێڕایەوە، بە هەر دوولایان، دژی ناوەڕۆکی ڕێککەوتنەکە ڕاوەستان، دەسیان بە هەڕەشەکردن کرد.
ئەز لەو باوەڕەدام، وەک چۆن هەوا بۆ مرۆڤ، ئاو بۆ ماسی، شیر بۆ منداڵی ساوا پێویستە، هەر بەو شێوەیەش، ئاشتیی بۆ کورد پێویستە. بۆیە هەر

کەسێ، هەر دەستەیە، هەر ڕێکخراوێکی رامیاریی کوردستان، لە هەر پارچەیە بێ، دژی ئەو پرۆسەی ئاشتییە ڕەفتاربنوێنێ، گەورەترین ناپاکیی بەرانبەر خوێنی شەهیدان و نەتەوەی کورد دەکا، بە دوژمنێکی گەورەی سەرسەختی کورد و کوردستان لە قەڵەمدەدرێ. چونکە جگە لەوەی، ئەورۆ کاتی ئەوە هاتووە، ئاشەمەکینەی جەنگ، بە یەکجاریی لە کاربخرێ و چیدیکە لەوە پتر نەگەڕێ، ئاشتییەکەش، کوێرایی بە چاوی دوژمنانی نێوخۆ، کۆنەجاش، بازرگانانی جەنگ، هەلپەرستەکانی نێو ڕیزەکانی پارتیی و یەکێتیدا دێنێ. بە شێوەیەکی گشتییش، لە قازانجی نەتەوەی کورد دایە، تەنیاوتەنیاش، داگیرکەرانی کوردستان زیانی لێدەبینن.

بەڵام کاتێ ئێمە، پێ لە سەر ئاشتیی دادەگرین، لە هەمان کاتیشدا دەبێ، ئەوە بزانین، مەبەستمان لە کام ئاشتییە؟ چ جۆرە ئاشتییەکمان دەوێ؟ ئاشتیی لەگەڵ کێ؟ ئاشتیی بە کێ پێکدێ؟ کێ دەیچەسپێنێ؟ کێ بروی پێدەدا و دەیپارێزێ؟ بۆ وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە، هەوڵدەدەین، بە چەند خاڵێکی کورت، باری سەرنجەکانی خۆمان دەربڕین :

1. دەبێ ئاشتییەکی ڕاستەقینەبێ، تا سەربێ و کاتیی نەبێ. تەنیا بۆ تاکتیک نەبێ. واتا لە بارەڕەوە هەڵتۆقلا بێ.

2. دەبێ ئاشتییەکی سەرتاسەریبێ، هەموو گۆشەیەکی کوردستان بگرێتەوە. هیچ ڕێکخراوێکی کوردستانی لێدەرنەکرێ.

3. نابێ، هەل بۆ دەوڵەتە داگیرکەرەکانی تورکیا و ئێران بڕەخسێندرێ، بۆ ئەوەی بە ئاسانیی، بە ئاماجە چەپەڵەکانی خۆیان بگەن، کەڵک لەو بارە وەرگرن. هەر دەوڵەتێکیان دەرفەت بێنێ، داشەهارەی خۆی بە سەر پارتی و یەکێتیدا سوارکا، کاسەی پڕی ئاشتیی و تەبایی نێوان خۆیان، وەک بەڵا و نەگبەتییە، لە سەری هەر دوو(حیزبی دیوکراتی کوردستانی ئێران و پارتی کارگەرانی کوردستان)دا بشکێنن. بە هیچ شێوەیە نابێ، گۆڕەپانی جەنگەکە بۆ باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان بگوێزرێتەوە. نابێ، سەرانی کورد وا تێبگەن، جەنگی نێوخۆ تەنیا لە نێوان پارتی و یەکێتیدا ڕوودەدا، بۆ ئەوەی ئاشتیی لە باشووری کوردستان بچەسپێنن، هەموو شتێ لای ئەوان ڕەوابێ! واتا گەر پەلاماری ئەندامان و هێزە چەکدارەکانی ئەو دوو ڕێکخراوە بدەن،

ئەوە بە ئەركی سەرشان و بە پێویستی بزانن، بە جەنگی نێوخۆی دانەنێن!
لێرەدا شتێ هەیە، پێویستە ئاماژەی بۆ بكەین، ئەویش ئەوەیە، توركیا و ئێران، وەك دوو دەوڵەتی گەورەی داگیركەری كوردستان، بەو هەموو سوپا گەورەیەوە، بەو هەموو چەكە مۆدێرنەوە، بەو هەموو توانا و دەسەڵاتەوە، گەر نەتوانن، پارێزگاریی سنوورە دەسكردەكانی خۆیان بكەن، ئایا پارتی و یەكێتی، بە چ شێوەیە دەتوانن، سنوورەكانی توركیا و ئێران بپارێزن؟ پاشان بۆ كێ و لە كێی دەپارێزن؟ بۆیە دەبێ، زۆر بە وردیی، بیر لەم كێشە گرنگە بكەنەوە، بە زمانی دیالۆگ و بە شێوازێكی نەرم، پێوەندیی بە سەرانی ئەو دوو رێكخراوەوە بكەن، هەموو شتێكیان بە ئاشتیی لەگەڵدا ببڕێننەوە، بۆ ئەوەی ئەم جارەش، هەموو لایەنەكان، لاقیان بە تەڵەی، سەرانی دەوڵەتە داگیركەرەكانی كوردستاندا نەتەقێتەوە!
جێگەی داخە، یەكێ لەو شتە خراپانەی، لە رێككەوتننامەكەدا تۆماركراوە، ئەوەیە، سێ جار، ناوی P.K.K بە تیرۆریست هاتووە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، هەر لە سەرەتاوە، مەترسیی بەردەوامبوون و دووبارەبوونەوەی جەنگی نێوخۆی لێدەكرێ!
4. چ « حدكا » و چ « پكك » دەبێ، چاوێ بە بەرنامەی تایبەتیی، كاری رامیاریی و سەربازیی خۆیاندا بخشێننەوە، هەرگیز بە فیتی دەوڵەتە داگیركەرەكان، كارێ نەكەن، زیان بەو بارودۆخە ناسكەی باشووری كوردستان و پرۆسەی ئاشتیی بگەیەنن.
5. ئەو ئاشتییەی لە ژێر باڵی ئەمەریكادا بەدیدەهێنرێ، پارتی و یەكێتی لە نێوچەكەدا، وەك كلك بە تەوەری توركیا ـ ئیسرایلەوە نەبەستێتەوە، چونكە گەورەترین دوژمنی نەتەوەی كورد توركە و لە داوارۆژیشدا كورد زیانی زۆری لێدەبینێ.
6. كۆمیتەیەكی تایبەتیی، لە كەسانی بێلایەن، نیشتمانپەروەر، پیاوانی ئایینیی و نوێنەرانی رێكخراوەكان پێكبهێنرێ، لە نزیكەوە چاودێریی جێبەجێكردنی پرۆسێسەكە بكەن. لە هەر جێگەیەكی كوردستان، هەر كەسێ، هەر لایەنێ، كارێكی خراپی كرد، بە مەرجێ لەگەڵ رێباز و ئامانجی پرۆسێسەكەدا نەگونجێ، هەر زوو بیگرن و دادگایی بكەن.

7. لەبەرئەوەی، چوار ساڵی ڕەبەق، جەنگی نێوخۆ لە کوردستان گەرمبووە، خەڵکێکی زۆر کوژراوە، جۆرە دوژمنایەتییە لە نێوان ڕۆڵەکانی گەلدا دروسبووە. دەبێ، زۆر ئاگاداری باری دەروونیی خەڵکی بکرێ. بە هیچ جۆرێ نەهێڵن، کاری تۆڵەسەندنەوە سەردەربێنێ، هەوڵبدەن، ئاسایش و هێمنیی شارەکان و نێوچەکانی دیکەی کوردستان بپارێزن.

8. دەبێ، دەزگاکانی ئاسایش، هەموو ڕێکخراوە پیشەیی، دیموکراسیی و رامیارییەکانی کوردستان، زۆر وریابن، ماوە بە سیخوڕەکانی چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکە نەدەن، دەسی نامەردانەی خۆیان، لە تێکۆشەرانی کورد بوەشێنن، سەرلەنوێ فتیلەی ئاگری جەنگی نێوخۆ هەڵگیرسێننەوە.

9. بمانەوێ و نەمانەوێ، بارزانیی و تاڵەبانیی، لە نێو ڕێکخراوەکانی خۆیاندا، دەسەڵاتێکی ڕەها و بێ چەندوچوونیان هەیە. دیارە، ئەم جەنگەماڵوێرانکەرانەیەش، لە سەر دەسەڵاتی رامیاریی و کێشەی ڕابەریی بوو. لەبەرئەوە، قورسایی جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەکە، بە پلەی یەکەم، لە ئەستۆی بارزانیی و تاڵەبانیی دایە. بۆیە هەر دووکیان بەرانبەر داگای گەل و مێژوو، وەک یەک بەرپرسیارن. جا بۆ ئەوەی، چیدیکە گەلەکەمان، بەرەو گێژاوێکی نوێ نەبەن، دەبێ، شەو و ڕۆژ، بە دڵ و بە گیان، کار بۆ ئاشتیی بکەن. هەوڵی جێبەجێکردنی خاڵەکانی ڕێککەوتننامەکە بدەن. ماوە بە هەلپەرست و دەستدەخۆرەکانی دەسەڕاست و دەسەچەپیان نەدەن، چیدی لەوە زیاتر، کلکی ئاژاوەیان، لە هەموو کاروبارێکی ڕێکخراوەکانیان و گەلی باشووری کوردستان وەردەن. لەبەرئەوە، زۆر بە پێویستی دەزانم، زووزوو یەکدی ببینن، تا ئەو بەستەڵەکە سایکۆلۆژییەی نێوانیان، بە تەواویی بتوێتەوە، هەرچی گرێوگۆڵێکی دەروونیی هەیە، لە نێوانیاندا نەمێنێ. بۆیە دەبێ، هەر دوو سەرکردەی ڕێکخراوەکە، بە کوڵودڵ هەوڵبدەن، ئاشتییەکە بە تەواویی بچەسپێ. هەر دووکیان ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی پرۆسێسەکە بکەن، بۆ کارێکی زۆر پەلە و پێویست نەبێ، هیچیان کوردستان بەجێ نەهێڵن.

10. دەبێ، لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا، هەموو خاڵەکانی ڕێککەوتنەکە جێبەجێکرێ. دەسەڵاتی هەر دوو ڕێکخراوەکە، لە هەر دوو ناوچەکەدا یەکبگرنەوە. لە کاتی خۆیدا هەڵبژاردن بکرێ، بە هیچ شێوەیە، هیچ

هەنگاوێ دوانەخرێ. بەڵام بە داخەوە، گۆڕانێ لە کاتی هەڵبژاردنی پەرلەماندا کراوە، ئەوەش خۆی لە خۆیدا، لە لایەکەوە گومان پەیدادەکا، لە لایەکی دیکەشەوە، جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەکە دوادەخا.
11. سەرئەنجامی هەڵبژاردنەکە، هەرچی چۆنێ بێ، دەبێ وەک خۆیان بەڵێنیانداوە، پەسەندییکەن. بە هیچ شێوەیە نابێ، ئەزموونی تفتوتاڵی پەنجاپەنجا دووبارەبکرێتەوە. گەر لایەکیان دەنگی پتری هێنا، لایەنەکەی دی کەمتربوو، دەبێ، زۆر بە سنگفراوانیی و بە دڵێکی پاکەوە، بەو سەرئەنجامە ڕازیبێ. بەرژەوەندیی بڵندی بزووتنەوەکە و گەلی باشووری کوردستان، پێش بەرژەوەندیی تەسکی پارتایەتی بخا. دیارە، ئەو لایەنەی دەنگ کەمتردەهێنێ، جەماوەری گەل هەر هێندەی دەوێ! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بە پێی ڕێژەی ئەو دەنگانەی دەیانهێنێ، لە پەرلەمان و میریی هەرێمدا بەشدارییدەکا، یا لە بەرەی ئۆپۆزیسیۆندا دەمێنێتەوە، تا جارێکی دی هەڵبژاردن دەکرێتەوە، چاوەڕێی هەلی سەرکەوتن دەکا.
گەر هەر دوولایان بەم شێوەیە، هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکدی بکەن، بەپێی پرینسیپەکانی دیمۆکراسیی بجوڵێنەوە و بڕیاربدەن، ئەوا جگە لەوەی جەنگی نێوخۆ، بۆ تاهەتایە زیندەبەچاڵدەکرێ، ڕۆڵە ڕەشورووتەکانی گەلی باشووری کوردستان دەبووژێنەوە، نیشتمانەکەمان دەگەشێتەوە و پێشدەکەوێ، کورد لە مەترسی لەدەسدانی دەرفەتەکە قوتاریدەبێ، ئەو کلتووورە دیمۆکراسییەش دەچەسپێ، لە داهاتووشدا هیچ لایە ناتوانێ، لێی لادا، وەک لە وولاتە دیمۆکراسییەکانی جیهاندا پێڕەودەکرێ. هەروەها هەموو گەلانی جیهان، ڕێخکراو و دەزگا نێو دەوڵەتییەکانیش، بە جۆرێکی دی لە گەلەکەمان دەڕوانن، بە شێوەیەکی دی، هەڵسرکەوت لەگەڵ کێشەی نەتەوەیی کورددا دەکەن، وەک پەیمانیشیانداوە، لە قڕکردن دەمانپارێزن.
12. ئەم تراژیدیا نوێیەی گەلەکەمان، کە لە ماوەی ئەم چوار ساڵەی جەنگی نێوخۆدا ڕوویداوە، نابێ، هەروا بە خۆڕایی چاوی لێ بنووقێنرێ. نابێ، ئەو ئەزموونە تفتوتاڵە، بێ هەڵسەنگاندن پشگوێبخرێ. بەڵکوو دوای ئەوەی، ئاشتیی ڕاستەقینە بە تەواویی دەچەسپێ، پێویستە لێکۆڵینەوەیەکی زانستانە و بێلایەنانەی لە سەر بکرێ، هەر دوولای شەڕکەر دەبێ، زۆر

ئازایانە، دەکۆمێنتەکانیان لە بەردەسی نووسەران و لێکۆڵەراندا دابنێن، تا بتوانرێ، دەسپێشکەر و تاوانباری ڕاستەقینەی جەنگ دیاریبکرێ. بەرەو ڕووی دادگای گەل و مێژوو بکرێتەوە، بۆ ئەوەی هەروا بە خۆڕایی، وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرنەچێ! ئەو کاتە دەبێ، ئەو لایەنە، دان بە هەموو هەڵەکانی خۆیدا بنێ. داوای لێبووردن، لە خێزان و بنەماڵەی شەهیدان بە تایبەتیی، لە سەرجەمی گەلی باشووری کوردستان بە گشتیی بکا، پەیمان نوێبکاتەوە، جارێکی دی تاوان و ناپاکیی وا دووبارەنەکاتەوە.

13. گەلێ بە پێویستی دەزانم، هەر کاتێ بارودۆخی کوردستان، بە تەواویی هێمن بووەوە، ئاشتیی لە هەموو گۆشەیەکی نیشتمانەکەمان، ڕەگی قووڵی داکوتا، ئەو کاتە کۆنفرانسێکی نەتەوەیی بگیرێ، هەموو کەسایەتییە نیشتمانپەروەرە بێلایەنەکان، پیاوانی ئاینیی، ئەکادیمییەکان، نوێنەری هەموو ڕێکخراوە پیشەیی، دیمۆکراسیی و ڕامیارییەکانی باشووری کوردستان، بەشداریی تێدابکەن، پەیماننامەیەکی نەتەوەیی مۆربکەن، بەڵێنی کوزدایەتیی و مەردایەتیی، بۆ گەلەکەمان نوێبکەنەوە. گفتبدەن، جارێکی دی، هیچ جۆرە گیروگرفتێکی نێوان ڕێکخراوەکان، بە جەنگی نێوخۆ چارەسەرناکەن، پەنا بۆ بەر چەک و هێز نابەن. پاشان ئەنجومەنێکی یەککرتووی ئاشتیی هەڵبژێرن، تا داهاتوویەکی دووریش کاربکا، ئەرکی سەرشانی، چەسپاندنی ئاشتیی و تەبایی ڕیزەکانی گەل بێ. هەر لەو کۆنفرانسە نەتەوەیی یەشدا دەتوانن، هەرچی گرفتی نێوان ڕێکخراوەکان و گەل هەیە، چارەسەرێکی بنەڕەتیی بۆ بدۆزنەوە، بە تەواوییش بڕیار لە سەر، پاشەڕۆژی گەلی باشووری کوردستان بدەن. چونکە ئەوە ماوەی هەشت ساڵە، کێشەی کورد لە بازنەیەکی بۆشدا دەخولێتەوە، ئیدی لەمەودوا بەرەو کوێ دەڕۆا؟ چی بکەین؟ هەنگاوی داهاتوومان چۆن دەبێ؟ تا ئێستا کەس هیچ نازانێ، چارەنووسی گەلەکەمان دیارنییە!!!

ئەورۆ کاتی ئەوەمان هاتووە، چ وەک تاک و چ وەک ڕێکخراو، کەمێ بیربکەینەوە، کەمێ لەگەڵ خۆمان و ڕۆڵەکانی گەلەکەماندا ڕاسگۆبین، درۆ لەگەڵ یەکدی نەکەین، یەکدی هەڵنەخەڵەتێنین. لە کانگای دڵەوە پێخۆشبوونی خۆمان، بەرانبەر پرۆسەی ئاشتیی دەرببڕین. وەک ڕۆڵەی

گەلێکی چەوساوە و بندەس، بە هەموو شێوەیە پشگیریی پرۆسەی ئاشتیی بکەین. بە هەموو توانامانەوە، هەوڵ بۆ چەسپاندنی بدەین. لەگەڵ ئەوەشدا، تا دەتوانین، دوژمنانی ئاشتیی ریسوابکەین. هەرچەندە لە ڕاستیدا، ئەز وەک کوردێ زۆر گەشبین نیم، بەڵام هەرگیز ڕەشبین نەبووم و ڕەشبینیش نیم، چونکە وەک مارانگازانمان لێهاتووە، مارانگازانیش لە خشەی پەتکێکیش دەترسن! جا بۆیە، گەر جەماوەری گەلەکەمان بسلەمێنەوە، یا باوەڕ بەو ئاشتییە نەکەن، ناهەقیان ناگرم! چونکە لەو بوارەدا، چەندین ڕێککەوتن و تاقیکردنەوەی، وەک دانیشتنەکانی(پەرلەمانی کوردستان، پاریس، دبلن و ئەنقەر)مان هەیە، هیچیان سەرکەوتوونەبوون. بۆیە تا هەر دوو سەرکردە، بە کردەوە نیازپاکیی خۆیان، بۆ جەماوەر نەسەلمێنن، باوەڕناکەم، کەس باوەڕیان پێ بکا! ئەورۆش دوو مانگی تەواو، بە سەر مۆرکردنی ڕێککەوتننامەکەدا تێدەپەڕێ، تا ئێستا شتێکی ئەوتۆ هەستپێناکرێ. بەڵام خۆزگە پرۆسەی ئاشتیی، بە تەواویی سەریدەگرت، بۆ تاهەتایە دەچەسپی، جا ئەو کاتە، با هەزارانی وەک ئێمە، گومانەکەی لە جێی خۆیدا نەبووایە!
کەواتا، با بە هەموومان کار بۆ چەسپاندنی ئاشتیی بکەین، چونکە دوورنییە، گەر ئەم جارە، ئەو هەلە زێڕینەمان لە کیسچێ، ئەوە دوا پەلەقاژەی مەرگی، هەوڵدانی پرۆسێسی ئاشتیی بێ! گەر ئەم جارە پرۆسێسەکە سەرنەگرێ، لەوانەیە هەموو ڕیسەکەمان بێتەوە بە خوریی! لەوانەیە ئیدی هیچ جۆرە چارەسەرێکی دیکەمان، لە بەردەمدا نەمێنێ! هێندەی دی ئەو ڕووبارە خوێنە کوردییە، بە خوڕ لە بەر گەلەکەمان بڕوا.
لە کۆتاییدا دەڵێم: هەرچەندە هیچ کوردێکی دڵسۆز، هەرگیزاوهەرگیز، ئەو چوار ساڵە وشکە، پڕ لە دڕکوداڵە مەترسییەی جەنگی نێوخۆی بیرناچێتەوە، هیچ کوردێکی نیشتمانپەروەری ڕاستەقینە، ناپاکیی سەرانی پارتی و یەکێتی لە یادناچێ. چونکە گەر ئەو چوار ساڵە، پڕ لە قاتوقڕیی، بەڵا و نەگبەتییەی جەنگی نێوخۆمان بیرچێ، گوێ بەو هەموو خوێنە کوردییە بەناهەقڕژاوە نەدەین، باوەڕناکەم، هیچ جۆرە ژیریی و دڵسۆزییەکی تێدابێ! ئەوەی ئەو مێژووە ڕەشەش لە بیر خۆی دەباتەوە، نیشتمانپەروەری ڕاستەقینە نییە. گەر کارەسات و ڕووداوەکانی ئەو چوار ساڵە لە یادکەین،

لەوانەیە لە ئایندەیەکی نزیکدا، بە خراپترین شێوە سەرهەڵبداتەوە. بۆیە ئەز لەو باوەڕەدام، هێشتا ناکۆکیی و دووبەرەکییەکە، بە تەواویی کۆتایی نەهاتووە، هێشتا هەموو دەردەکان تیمار نەکراون. هێشتا هەموو زامەکان قەتماغەیان نەبەستووە. ئەمەی تا ئێستا هەیە، هەر ئەوەیە، بارزانیی و تاڵەبانیی ڕێککەوتننامەیەکیان ئیمزاکردووە، چەند جارێ یەکدیان بینیوە، لە سەر شووشەی تێلێڤیزیۆنەکانی جیهان دەرکەوتوون، ئەمانەش هەمووی، بە شتێکی سەرزارەکیی و بابەتی ڕۆژانەی کاری ڕامیاریی و دیپلۆماسیی دادەنرێن. بەڵکوو لە هەموو شتێ گرنگتر ئەوەیە، هەر دوو لایان، خاڵ بە خاڵی ڕێککەوتننامەکە جێبەجێبکەن. هیچ کەلێن و کەلەبەرێ، بۆ بروبیانووی پێکدادانی دوارۆژ نەهێڵنەوە، چونکە ئاشتیی، تەنیا هەر بە دەنگ نییە، بەڵکوو بە ڕەنگە!

هەروەها، جگە لەوەی نابێ، سەرانی پارتی و یەکێتی، ڕێگا بە هیچ گێرەشێوێن و ئاژاوەچییەکی نێوخۆ بدەن، سەرلەنوێ فوو لە ئاگر بکا و گڕی جەنگەکە خۆشبکاتەوە. لە هەمان کاتیشدا دەبێ، گوێ بۆ سرتەوبۆڵە، هەڕەشە و چاوسوورکردنەوەی، دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان ڕانەگرن. دەبێ، بە هەموو توانایەکمانەوە هەوڵبدەین، ئاشتی لە کوردستاندا بچەسپێنین، هەر کارەساتێ، ناخۆشییە لە هەر شوێنێکی کوردستان ڕوویدا، هەر زوو دەبێ، چواردەوری بگیرێ، دەنگی کپکرێ، هەر لە بێشکەدا بتاسێنرێ، لە شوێنی خۆیدا سزای تاوانباران بدرێ، بە هیچ شێوەیەکیش نەهێڵین، وەک سەرەتای جەنگەکە، لە شارۆچکەی « قەڵادزێ »وە دەسپێکرد، پاشان هەموو کوردستانی گرتەوە، جارێکی دیکە بەو شێوەیە بتەنێتەوە و جەنگێکی دی سەرتاسەریی هەڵگیرسێتەوە.

[illegible] خەریکە ڕەگی گوڵیی جەنگی نێوخۆ دەقرتێ، خونچەی هیوای کورد دەگەشێتەوە، بۆیە لێرەدا بە پێویستی دەزانم، زۆر بە ڕاشکاویی بڵێم: هەزار سڵاو و ئافەرین، بۆ هەموو ئەو کوردە بە ئەمەک و بە ئابڕووانەی، چ لە کوردستان و چ لە هەندەران، چ لە دوورەوە و چ لە نزیکەوە، چ بە دەم و چ بە کردەوە، بە هیچ جۆرێ، بەشدارییان لەو جەنگە چەپەڵ و ناپاکییە گەورە مێژوویی یەدا نەکرد، چیلکەوچەوێڵی پتریان لە ئاگری کوردقڕان

ئەهاویشت، ئەورۆ بە ملکەچیی، لە بەر دادگای ڕەوای گەلدا ڕانەوەستاون، شەرمەزاری بەر دەروازە گەورەکەی مێژوو و یەزدانی گەورە نەبوون، سەریان هێندەی هەموو چیا سەرکەشەکانی کوردستان بەرزە، هێندەی قوڵایی هەموو زەریاکان، شانازیی بە خۆیان و نەتەوەکەیانەوە دەکەن!

ستۆکهۆڵم
1998/ 11 /18

تێبینی :

1. ناوەڕۆکی ئەم گوتارە، دوو جار لە ڕادیۆی « هەنگاو »ی شاری « ستۆکهۆڵم » لە(1998/09/13 و 1998/10/18) باسکراوە.

2. جارێ لە بەرنامەی ڕادیۆی « هێڵی » شاری « مالمۆ » لە (1988/09/27)، بە وتووێژێکی تێلێفونی ڕاگەیەندراوە.

3. لە دیمانەیەکی « تێلێـفـیـزیۆنی نامـێـز »، لە شـاری « یۆتێبۆری » لە (1988/10/31)دا بڵاوکراوەتەوە.

4. هەروەها جـارێکی دیکەش، لە ڕادیۆی « هەنگاو »، لە(1998/11/15) خوێندرایەوە.

5. دوای ئەوەی دوو مانگی تەواویش، بە سەر مۆرکردنی ڕێککەوتننامەکەدا تێپەڕبوو، لە شێوەی ئەم گوتارەدا ئامادەکرا.

6. لە گەرمەی جەنگی نێوخۆیی نێوان پارتی و یەکێتیدا، نامەیەکی درێژم بۆ هەر دوو سەرکردەی ئەو دوو ڕێکخراوە نووسیی و بۆم ناردن. لەبەرئەوەی ناوەڕۆکی ئەم گوتارە، لە گەلێ ڕووەوە، پێوەندییەکی زۆری بە ناوەڕۆکی ئەو نامەیەوە هەیە، بە پێویستم زانی، وەک خۆی چۆن بووە، لە کۆتایی گوتارەکاندا بڵاویکەمەوە. تکایە تەماشای ل93 بکە.

# ئۆجەلان

# ئەزموونێکی نوێ

# و

# پەندی مێژوویی

هەمــوومــان دەزانین، مــاوەی پازدە ســاڵێ دەبێ، شــۆڕشی چەکــداریی لە باکــووری کــوردســتــان دەســیــپــێکردووە. مــاوەی پازدە ســاڵێ دەبێ، گــریلا ئازاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان، تەنگیان بە کاربەدەستانی، دەوڵەتی داگــیــرکــەری تورک هەڵچنیــوە. گــەورەترین زیانیــان بە ئابووریی تورکــیــا گــەیاندووە. بۆیە هیچ ڕێگایەکی ســەرکــوتکەرانە نەمــاوە، تورکــەکــان بەکــارینەهێنن. هیچ دەوڵەتێ نەمـــاوە، پەنای بۆ نەبەن، تا جــوڵانەوە چەکدارییەکەی P.K.K لەنێوبەرن. تەنانەت لە دوا پەلەقاژەی مەرگیاندا خەریکبوون، پەلامــاری سووریا بدەن، جەنگێکی گــەورەی ماڵوێرانەکــەرانە هەڵگیرسێنن، نێوچەی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست، لە زەریای خوێن و فرمێسکدا نقومبکەن.

تا ئۆجەلان لە ســووریا بوو، تا دەســەلاتی هەبوو، تا گــلــۆڵەی بەرەو لێژی تلۆرنەبووبۆوە، بە شێوەیەکی دیکە خۆی دەنواند، کرداریدەکرد، گوتاریدەدا،

هەڵوێستێکی دیکەی، بەرانبەر سەرانسەری کێشە نەتەوەیی یەکانی کورد هەبوو. بەڵام ئەورۆ، لە جیهانێکی دیکەی گەلێ جیاوازدا دەژی، شێوەیەکی دیکەی هەیە، ئەو توانا و دەسەڵاتەی نەماوە، تووشی شکستێکی رامیاریی و سەربازیی بووە. بۆیە وا بەو شێوەیە، تامی دەمی گۆڕاوە، زمانی توندوتیژیی و هەڕەشەکردنی بڕاوە. تەنانەت جەماوەری کوردیش، پێبەپێی ئەو بارودۆخە گۆڕاون. هێندێ لەوانەی کاتی خۆی، کاڵەکخۆربوون و بێستانڕن نەبوون، هەمیشە ویردی سەر زمانیان، ئۆجەلان بوو، ئەورۆ پشتیان لە رووگەی بێستانەکەی وەرگێڕاوە. هێندێکی دیکەش، لەوانەی دژایەتییاندەکرد، ئەورۆ هەڵوێستیان گۆڕیوە، چونکە ئەرکی نیشتمانیی و نەتەوەیی وا پێویستدەکا، بە هەموو توانایەکەوە پشتگیریی بکەن و دژی دەوڵەتی کۆلۆنیالیستی تورک بوەستنەوە.

وە نەبێ، ئەز ئێستا ئەم قسانە دەکەم، یەکێ لەو کاڵەکخۆرانە بووبم، ورگم لە بێستانەکەی « ئۆجەلان »دا تێرکردبێ، هەڵەکەسەمام بۆ کردبێ. بە پێچەوانەوە، ئەوەتەی پێوەندیم، لەگەڵ ئەندامانی ئەو رێکخراوەدا هەیە، هەمیشە دەنووکم لەسەریانبووە، بەرەورووو رەخنەم لێگرتوون. تەنانەت زۆر بە راشکاویی و بە ئاشکرا، لە کۆبوونەوەکانی گۆنگرەی نەتەوەیی لە برۆکسل و ستۆکهۆڵم، لە کۆڕە رووناکبیرییەکانی شاری ستۆکهۆڵم، لە سەر شووشەی تێلێڤیزیۆنی مەد و لە رێگەی رادیۆ کوردییەکانی شاری ستۆکهۆڵمەوە، رەخنەی توندوتیژم ئاراستەکردوون، بە شێوەیە سەرانی ئەو رێکخراوە، هەموو پێوەندییەکیان لەگەڵ مندا پچڕاندووە. چونکە رێکخراوێکی هێندە کەللەرەق و لووتبەرزبوون، رەخنەیان لە کەس قەبووڵ نەدەکرد. کەس بۆی نەبوو، بە خراپ ناوی سەرۆک « ئاپۆ »یان بەرێ! بەڵام ئەورۆ، هەستدەکەم، ژیانی ئۆجەلان لە مەترسیدایە، P.K.K. لە تەنگانەدایە، دوارۆژی گەلی باکووری کوردستان، لە بارێکی سەختدایە، تورکە داگیرکەرەکان بە هەموو شێوەیە، هەڕەشە لە چارەنووسی، شۆڕشی چەکداریی گەلی باکووری کوردستان دەکەن. بۆیە منیش وەک ناسیۆنالیستێکی نیشتمانپەروەری کورد، دەنگی خۆم بڵنددەکەم، تا دەتوانم، داکۆکیی لە ژیانی ئۆجەلان، دوارۆژی گەلی باکوور و چارەنووسی شۆڕشە رەواکەیان دەکەم.

دیاره، ئەو کوردانەی، خەڵکی هەر پارچەیەکی کوردستان بن، گەر لە هەموو سەردەمێکدا، بە دوای بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیاندا وێڵبن، گومانی تێدا نییە، بە هەموو جۆرێ، دژی بزووتنەوەی کوردایەتی ڕادەوەستن. هەمیشە وەک پوازی کوردیی، چ بە دەم، چ بە نووسین، چ بە کردەوە، وەک کەری دێز، حەز بە تۆپینی خۆیان و مردنی خاوەنەکانیان دەکەن. تەور ئاسا پوازیان لە دارە. بۆیە ئەوڕۆ زۆر بێشەرمانە، دژی خەبات و ئامانجەکانی P.K.K. ڕادەوەستن. ئاوات بە مەرگی ئۆجەلان دەخوازن. شانبەشانی داگیرکەری تورک، بە هەموو شێوە هەوڵدەدەن، ڕێکخستنی P.K.K. لەنێوبەرن، تا ئافەرینێکی ژەنەڕاڵەکانی تورکیان پێببڕێ، دڵی ئاغاکانیان ڕازیکەن. بە لای منەوە، ئەو جۆرە کەسانە، تەنیا بە زمان کوردن، ئەگینا کوردێ، لە هەست و هۆشی نەتەوەیی شۆرابێتەوە، هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی دیکەی بۆ ناکرێ، جگە لەوەی، لەگەڵ داگیرکەری تورکدا هاوئامانج و هاوڕێن. چونکە یەک ئامانج کۆیاندەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە، P.K.K. نەهێڵن! جا گەر ئەو مافە، وەک داگیرکەرێ بە تورک بدەین، بە دڕندانەترین شێوە پەلاماری کورد بدا و بیستوێنێتەوە، ئەوا نازانم، ئەو جۆرە کوردانە، بۆ دەبێ، هێندە ساویلکەبن، مەرگی خۆیان بە ئاوات بخوازن؟!! تۆ بڵێی، جگە لە خۆفرۆشتن و چڵکاوخۆریی تورک زیاتر، لە هیچ فەرهەنگێکی دیکەی ئەم جیهانەدا، جێگایان بێتەوە؟!!

زۆرم لا سەیرە، ناکۆکیی لە سەر دەسەڵات، جیاوازیی دید و بۆچوون، لە نێوان سەرکردەی ڕێکخراوەکانی کوردستاندا، بەو ڕادەیە بگا، بۆ دوژمنە خوێنەخۆرەکانی خۆیان، وەک سەگەکانی ڕەزاخان، کلک و گوێی یەکدی بخۆن! ئەمە گەر لە کورد ڕووینەدابێ، ئایا لە سەرتاسەری مێژووی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا، لە نێو چ نەتەوەیەکی ئەم سەر زەوییەدا ڕوویداوە؟!! بۆیە ئەوەی ڕۆژێ کوردی ناسیبێ، بێ پەردە کوردی، بە نەتەوەیەکی خۆخۆر، ناکۆک و ناتەبا داناوە.

بە باوەڕی من، ئەو ناکۆکییەی لە نێوان ئۆجەلان، بارزانیی و تاڵەبانییدا هەیە، ناکۆکییەکە بە پلەی یەکەم، دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستان دروسیانکردووە. هەر ئەوانیش، ڕۆژبەڕۆژ بازنەی ئەو ناکۆکییانەی

نێوانیان، گەورەتردەکەن و گەشەپێدەدەن. چونکە هەر کاتێ، داگیرکەران چۆکیان بە ویست و ئارەزووی، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان دانەدابێ، بە چەک دەرەقەتی کورد نەهاتبن، ئەوا هەر زوو وەک پیشەی سەدان ساڵەیان، پەنایان بۆ بەر ئاژاوەنانەوە و گێرەشێوێنیی بردووە، تیرە و هۆزەکانی کوردیان، بە گژ یەکدیدا کردووە، کوردی نێوچە جیاجیاکانی کوردستانیان، لە یەکدی بەرداوە، جەنگێکی خوێناوی کوردکوژییان هەڵگیرساندووە. بۆیە نووسەرێکی وەک « کەسپار دایمون » لە ساڵی(1809 )دا گوتوویەتی:
(تورک و ئێران لەوە بێهێزترن، کە بتوانن، بە چەک سەر بە کوردەکان دانەوێنن. لەبەرئەوە، ئاژاوە ئەخەنە ناو هۆزەکانەوە، یارمەتی لایەک ئەدەن و لایەکی تر تێژئەکەن و هەمیشە لەمەدا، کەڵکی خۆیان وەرئەگرن)«32،11»
لەبەرئەوە، هەرچی جۆرە ناکۆکییە، لە نێوان سەرکردە و ڕێکخراوەکانی کوردستاندا هەبێ، دەبێ، هەمیشە وەک یاسا و سەرەتایەکی نەتەوەیی، ئەوە لە یادنەکرێ، هەر دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستان کەڵکی لێوەردەگرن، تەنیا لەو کەلێنانەشەوە، زەفەر بە کورد دەبەن. تەنیاوتەنیاش، هەر کورد زیانی لێدەکەوێ. دەبێ، ئەوەش بزانین، لە هەر شوێنێکی ئەم جیهانەدا، هەر سەرکردەیەکی کورد، هەر ڕێکخراوێکی کوردستانیی، بە هەر جۆرێ، تووشی زیانێکی بچووک یا گەورە ببێ، ئەوا بێ چەندوچوون، زیانێکی گەورە، لە سەرجەم بزووتنەوەی کوردایەتیی دەکەوێ. وەک پەیامبەری ئیسلامیش دەفەرموێ: (گەر یەکێ لە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ، بە دەس ئازارێکەوە ناڵاندی، هەموو ئەندامەکانی دیکەی جەستەی هاوار دەکەن).
بۆیە دەبێ، هەموو ئەو ناکۆکییە لاوەکییانە وەلاخەین، هەمیشە برابین، ڕوو لەیەکدی و پشت لە دوژمن بکەین، پشتی یەکدی بگرین، بە هەموو شێوەیە، دژی هەموو نەخشە و پیلانە گلاوەکانی، داگیرکەرانی کوردستان ڕابوەستین، بەرژەوەندیی باڵای نەتەوەی کورد، لە سەروو هەموو شتێکی دیکەوە دابنێین، نەک هەر کاتێ داگیرکەرەکە ویستی، وەک کەر کورتانمان کا، بۆ کوێی بوێ، هەر چۆنێکی بوێ، وامان لێخوڕێ!
هەر وەک هەژاری موکریانیی دەڵێ: (هەر کەس لە هەموو جیهاندا ناوی تورکی بەر گوێ کەوێ، نەعوزەنبیللایەک دەڵێ، تورک و دڵڕەشیی و

خوێنەخۆریی سێ ووشەن لە یەک مانادا. مێژووی ئەورووپا و ئاسیا، چەندین سەدە لە باسی شومیی و بەدفەڕیی حوکمی تورکان هەڵازناوە.)«8،840»
هەڵبەتە، هەموو مرۆڤێکی بە ویژدان دەزانێ، هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر بە چاوی خۆی دەیبینێ، سەرانی دەوڵەتی کۆلۆنیالیستی تورک، بە چ شێوەیە، مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ، لە تورکیادا پێشێلدەکەن، بە دەیان تاوانی تیرۆریستیی، بە ئەنجامدەگەیەنن، ساڵانە بە هەزاران تەن، تلیاک بە ئەورووپا دەفرۆشن، کەچی سەرەڕای ئەوەش، هەموو ئەو تاوانانە، بە نێوچەوانی(ئۆجەلان و P.K.K)ەوە دەلکێنن! پێش ئەوەی، بەرەو قووڵایی باسەکە هەنگاوبنێین، لێرەدا دەمەوێ، دوو خاڵی گرنگ روونبکەمەوە :
یەکەم ـ کێشەی تیرۆریستیی: ئەوڕۆ وا خەریکە، تیشکی خۆری سەدەی بیستەم ئاوادەبێ. نزیکەی بیست میلیۆن کورد، لە باکووری کوردستاندا دەژین، لە هەموو جۆرە مافێکی نەتەوەیی و مرۆیی خۆیان بێبەشکراون. لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە، بە خراپترین شێوە دەچەوسێندرێنەوە، بە هیچ شێوەیە، دان بە بوونی نەتەوەیی و کێشە ڕەواکەیاندا نانێن، بە هەموو شێوەیە، هەوڵی تواندنەوەیان دەدەن. کەچی تازە سەرانی دەوڵەتێکی کۆلۆنیالیستی وەک تورکیا، ئەو تاوانانە دوای کورد دەخەن! شتێکی سەیر نییە، گەر داگیرکەرانی کوردستان، دەوڵەتێکی وەک ئیسرایل و زلهێزێکی وەک ئەمریکا، هەرچی پڕوپاگەندەی ناشیرین و تاوان هەیە، دوای سەرکردە، ڕێکخراو و شۆڕشەکانی کوردی بخەن. چونکە لە لایەکەوە، ئەمە یەکەم جار نییە، ئەم تاوانانە لە ملی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمانەوە دەئاڵێنن. لە لایەکی دیکەشەوە، لەوە زیاتر دەبێ، چی لە دەوڵەتێکی داگیرکەری گەورەترین بەشی کوردستان و دۆستەکانی چاوەڕێبکەین؟
بەڵام ئەوەی لێرەدا جێی داخە، ناکۆکیی و دووبەرەکیی نێوان ڕێکخراوە کوردستانییەکان، بە ڕادەیە گەیشتووە، تازە هێندێ کوردی ساویلکە، لە شیرین خەوی غەفڵەتدان، تازە هێندێ ڕێکخراوی کوردستانیی، بە دەم خەوەوە دەبزڕکێنن، ناووناتۆرەی ناشیرین و درۆودەلەسەکانی تورک، دوای ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕی وەک P.K.K. دەخەن. بە هەموو توانایانەوە، دژی خەباتی رامیاریی، بزووتنەوەی چەکداریی، ئامانج و ئاواتەکانیان

رادەوەستن! بە تیرۆریست و قاچاغچیی نێوزەدیاندەکەن! لێرەدا بۆمان هەیە، لەو کوردانە بپرسین: کێ ئەم ناووناتۆرانەی بە سەر(ئۆجەلان و P.K.K.)دا دابڕیوە؟ ئایا جگە لە تورک و هاوسەنگەرەکانی، هیچ لایەنێکی دیکە هەیە، ئەو تاوانانەی پاڵ ئەوان دابێ؟

لە ڕاستیدا، کێشە و باسی تیرۆریستیی، لە جیهانی ڕامیارییدا، شتێکی نوێ نییە. بەڵکوو هەر کاتێ، داگیرکەران ویستبێتیان، کەسایەتییە شۆڕشگێڕ و ڕێکخراوەکانی گەلانی بندەستی ئازادیخوازی جیهان، سووک و ڕیسوابکەن، ئەوا چەند تاوانێکی وەک بەکرێگیراو، چڵکاوخۆر، ناپاک و تیرۆریستییان پێوە لکاندوون. شتێکی زۆر سەیر نییە، گەر سەرکردەیەکی تێکۆشەری وەک « یاسر عەرەفات » و ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕی وەک (ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین)، لە لایەن دەوڵەتی داگیرکەری ئیسرایل و ئیمپریالیزمی ئەمەریکاوە، تا دوێنێ بوو، بە تیرۆریست ناودەبران. ئەو عەرەفاتەی هاوڕێی تیرۆریستێکی وەک « کارلۆس » بوو، لەگەڵ دوو ڕێکخراوی مافیا و تیرۆریستی وەک(بەدرماینهۆف و ئاڵای سوور)دا هاوکارییدەکرد، کەچی ئەوڕۆ، زۆر ڕێزی لێدەگرن، بە شۆڕشگێڕ، تێکۆشەر، نیشتمانپەروەر، دیموکراسیخواز و ئاشتیخواز باسیدەکەن. تەنانەت خەڵاتی ئاشتییشی وەرگرت! کەچی فەلەستینییەکان، جاران چۆن بوون، ئێستاش هەر وان! هیچ لە کێشەکە نەگۆڕاوە، تەنیا ئەوەندە هەیە، ئەوڕۆ لە دەربەدەریی ڕزگاریانبووە، لە سەر خاکی خۆیان تۆزدەکەن و ئاڵای فەلستین، بە سەر کۆشک و تەلارەکانیانەوە دەشەکێتەوە!

با لێرەدا، نموونەیەکی دیکەی زیندوو بێنینەوە. دوای ئەوەی، بەعس لە ساڵی(1968)دا، بە پیلانی ئیمپریالیزم، کودەتا خوێناوییەکەیان جێبەجێکرد، دەسیان بە سەر دەسەڵاتی ڕامیاریی و دەزگاکانی دەوڵەتدا گرت، هەموو ڕۆژێ، لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی دەوڵەتەوە، بە دەیان تاوانیان پاڵ سەرۆک بارزانیی دەخست. تاوێ بە چڵکاوخۆری ئێران، تاوێکی دیکەش بە بەکرێگیراوی ئیسرایل و ئەمێریکا، تاوانباریاندەکرد. تەنانەت هێندێ کوردی هەڵخەڵەتاویش، پروپاگەندەکانی دوژمنان و داگیرکەرانیان دووبارەدەکردەوە، قسەی ساردوسووکیان، بە سەرۆک بارزانیی دەگوت. لە

تیلیڤیزیۆنی کەرکوکەوە، کاریکاتێریان لە سەر بارزانیی پیشاندەدا، بە (مەلا چۆمبی!) ناویاندەبرد. ئەم کاریکاتێرە، ماوەیەکی زۆر، هەموو ڕۆژێ چەندین جار پیشاندەدرا. کەچی کاتێ، لە(11/مارسی/1970)دا، سەرکردایەتی شۆڕش و بەعس پێکهاتن، ڕێککەوتننامەکەی نێوانیان بڵاوکرایەوە، ئیدی هەر هەمان بارزانیی چڵکاوخۆر و بەکرێگیراو بوو، زۆر بە ڕێزەوە باسدەکرا، سەرانی بەعس سەردانیاندەکرد، ئەسوکایەتیپێکردن لە گۆڕێداما، نە کاریکاتێریش پیشاندەدرا! نە کوردە هەڵخەڵەتاوە نەیارەکانی بارزانیش، قسەی نابەجێی دەزگاکانی بەعسی داگیرکەریان دووپاتدەکردەوە. بەڵکوو بارزانیی، لە مەلا چۆمبیی، چڵکاوخۆر، بەکرێگیراوی ئێران، ئیسرائیل و ئەمێریکا ڕزگاریبوو، وەک پیاوێکی تێکۆشەر، نیشتمانپەروەر، ئاشتیخواز، خواناس و سەرکردەی گەلی کورد ناسرا!
ئەمە گەر شتێ بگەیەنێ، تەنیا ئەوەیە، کورد هەرگیز نابێ، بەیتوبالۆرە و قسەی ناشیرنی داگیرکەرانی بە مێشکدا بچێ. گەر دوێنێ، ناو و خەباتی سەرۆک بارزانییان، بەو پروپاگەندانە لەکەداردەکرد، ئەورۆ مەسعوود بارزانیی و جەلال تالەبانیی، بە بەکرێگیراوی ئەمێریکا دادەنێن! ئایا ئەم جۆرە پروپاگەندانە ڕاستن؟ نەخێر. بەڵام بمانەوێ و نەمانەوێ، کورد پێویستی بە یارمەتیی و پشگیریی، ئەو دەوڵەتە گەورانە هەیە. ڕاستە، ئەوان لە بەر خاتری چاوی کاڵی کورد، ئەو یارمەتییە نادەن و ئەو پشگیرییە ناکەن. بەڵکوو چۆن کورد پێویستی بە یارمەتیی ئەوان هەیە، ئەوانیش لە نێوچەکەدا، بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان هەیە، پێویستیان بە کورد هەیە، تا نەخشە و پلانەکانیان جێبەجێبکا. هەرچەندە، هەمیشە هەر ئەوان، گرێویان بردۆتەوە و کورد دۆڕاندوێتی، هەر ئەوان سەرکەوتووبوون و کورد ژێرکەوتووبووە، هەر ئەوان ئامانجەکانی خۆیان بەدیهێناوە، کوردیش ئامانجەکانی خۆی نەپێکاوە. چونکە ئەوان، بە نەخشە و پلان کاریانکردووە، کورد نەخشە و پلانی نەبووە. ئەوان لە گەلی کورد بە تواناتر و زاناترن، دەسەڵاتی پتریان هەیە، گەلێ دۆستی گچکە و گەورەشیان، لە نێوچەکە و جیهانیشدا هەیە، بەڵام کورد وەک سڵقی ڕووت وایە و کەسی نییە!

ده دیاره ئەوڕۆش، کێشە و باسی تیرۆریستیی و تلیکافرۆشتنەکەی (ئۆجەلان و P.K.K.)ش، هەر لە هەمان قاڵبدا جێگای دەبێتەوە. تورکیا، ئیسرایل و ئەمێریکا، ئەم جۆرە پڕوپاگەندە ژاراوییانە بڵاودەکەنەوە، کوردە بێهۆش و گۆشەکانیش، دووبارەیاندەکەنەوە. ئەگینا ئەوا ماوەی حەفتاوپێنج ساڵ دەبێ، دەوڵەتی نوێی تورکیا دامەزراوە، گەلی باکووری کوردستان، بە هەموو شێوەیە دەچەوسێننەوە، بە هەزاران کوردیان تیرۆرکردووە، چەندین کۆمەڵکوژیی وەک شیوی « زیلان »یان بە ئەنجامگەیاندووە، بە سەدان جار، لە بەر چاوی باوک، برا و مێرد، بە ئاشکرا لاقەی دایک، خوشک و ژنانیان کردووە، گەر خەڵکی وێژدانیان هەبێ، دەبێ، زۆر بە ڕاشکاویی، دان بە تاوانەکانی تورکدا بنێن.
بە ڕاستیی، تراژیدیایەکی سەیر و پڕ لە شەرمەزاریی و گاڵتەجاڕانەیە، مێژوو بە خراپترین شێوە خۆی دووبارەدەکاتەوە. کورد هەرگیز فێری تێکۆشانی ڕاست نابێ. کەڵک لە تاقیکردنەوەکانی مێژوو وەرناگرێ. جیاوازیی لە نێوان دۆست و دوژمندا ناکا. پەی بە پیلانە چەپەڵەکانی داگیرکەران نابا. هیوادارم، گەر کۆمەڵانی خەڵکی کورد، گوێ لە نووسەر و نیشتمانپەروەرانی کورد ناگرن، گوێ لە ئاژاوەچیی، گێرەشێوێن و ناپاکەکانی کوردیش نەگرن! نازانم، بۆ ئەو جۆرە کوردانە، گوێ بۆ پڕوپاگەندەکانی تورک و داگیرکەرانی دیکەی کوردستان ڕادەدێرن؟ کەچی گوێ بۆ دوو دیمۆکراسیخوازی مرۆدۆستی تورکی وەک (سمایل بێشکچیی) زاناو نووسەر، « ئێکیم بیرداڵ »ی سەرۆکی کۆمیتەی مافی مرۆڤ لە تورکیادا ڕاناگرن، کە هەردووکیان بە دوو دۆستی هەرە نزیک و دڵسۆزی نەتەوەکەمان دادەنرێن! ئایا تەنیا لەبەرئەوەیە، ئەوان پشگیریی کورد دەکەن، گولی گەنجێتی خۆیان، ژیانیان، سەر و ماڵیان، لە پێناوی کێشە ڕەواکەی کورددا بەختکردووە، یا هەر کورد خۆی، نەتەوەیەکی بێ هەست و هۆشە، ڕاست و چەپی خۆی نازانێ، چاک و خراپ لێکجیاناکاتەوە، دۆست و دژمنی خۆی بە باشیی ناناسێ!
بۆیە دەبێ، جارێکی دی لە خۆمان بپرسین: کێ تیرۆریست و قاچاغچیی ڕاستەقینەیە؟ کێ لە تورکیادا، مافی کورد و مرۆڤ پێشێلدەکا؟ ئایا

(ئۆجەلان و P.K.K.) تیرۆریستن، یا سەرانی دەوڵەتی تورک؟ من پێموایە، گەر یەک تیرۆریست لە تورکیادا هەبێ، تەنیا دەسەلاتدارانی تورک خۆیانن، هەر لە ئەتاتورکەوە تا بە مەسعوو یەڵماز دەگا! ئایا ئەندامانی P.K.K. قاچاغچیێتی دەکەن و تلیاک دەفرۆشن، یا سەرانی رژێمی تورک، ئەو کارەدەکەن؟ ئایا لە باکووری کوردستان و تورکیادا، P.K.K. خەڵک دەکوژێ، یا میتی تورکیی و رێکخراوە شۆڤێنیستەکانی تورک، خەڵک دەکوژن؟!! وا بزانم، هەر مرۆڤێ کەمێ هۆشی هەبێ، بەکرێگیراوی لایەنێ نەبێ، شتەکان بە لێکدانەوە و وێژدان هەڵسەنگێنێ، لەگەڵ دەروونی کەیلی خۆیدا، ئەم شتانە بەراوردبکا، بەو ئەنجامە دەگا، هەرچی ئەم بەیتوباڵۆرانە هەیە، دەوڵەتی تورکیای داگیرکەر دەیهۆنێتەوە، کوردە ساویلکە و ناپاکەکانیش، زۆر بێباکانە کاوێژیدەکەنەوە! مەگەر ئەوانەی بڕیاریاندابێ، تا سەر دوژمنی خۆیان و نەتەوەکەیان بن، ئەگینا هیچ باوەڕ و وێژدانێ ئەوە پەسەند ناکا، کورد بەو شێوەیە، دواکەوتووبێ، لە بندەسی تورکدابێ، بە هەموو جۆرێ بچەوسێندرێتەوە، کەچی هێندێ کورد هەبن، کاغەزی سپی پێشکەوتنخوازیی، دیمۆکراسیخوازیی و مرۆدۆستیی بۆ تورک مۆربکەن. بە هەموو شێوەیە، پشتی داگیرکەری تورک بگرن. هەروەها لە هەمان کاتیشدا، تاوانی تیرۆریستیی و تلیکافرۆشیی، بە تەوێڵی(ئۆجەلان و P.K.K.)ەوە بنێن، هەموو خەسڵەتێکی خراپیان، دوابخەن! ئەمە وەک « پیرەمێرد »ی نەمر دەفەرموێ: مەگەر هەر مەسەلەی کورد بێ و لە کورد ڕویدابێ، ئەگینا وەک دەڵێن: لە قوتووی هیچ عەتارێکدا جێی نابێتەوە!!!

دووەم ـ ڕووداوەکە لە ڕووی مێژوویی یەوە: هەڵبەتە، ئەمە یەکەم جار نییە، سەرکردەکانی کورد و شۆڕشی کوردستان، تووشی هەرەس و کارەساتی تێکشکان دەبن. ئۆجەلان، یەکەم سەرکردەی ڕێکخراوێکی کوردستانیی نییە، لاقی بە تەڵەی داگیرکەراندا دەتەقێتەوە، بەو شێوەیە دەسی بە زاخدا دەکرێ. واتا ئەم تاقیکردنەوەیەی ئۆجەلان، لە مێژووی نەتەوەکەماندا، شتێکی نوێ نییە، بەڵکوو هەر هەمان ڕووداوە، بەلام لە سەردەمێکی دیکەی مێژوووییدا، بە شێوەیەکی دیکە دووبارەدەبێتەوە.

هەموومان دەزانین، هەر کاتێ، دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان

ویستبێتیان، سەرۆک تیرە و هۆزێکی کورد، رابەری شۆرشێ، رێکخراوێکی رامیاریی کوردستان، وەک مقاشێ بەکاربهێنێن، هەر کە ئامانجەکانی خۆیان بەدیهێناوە و ئیشیان پێیان نەماوە، ئیدی زۆر بە ئاشکرا، بە تەواویی پشتیانتێکردوون، دەسبەرداریانبوون، بە یەکجاریی هێز و توانایان لێ بریوون، لە سەر خوێن و فرمێسکی کورد، لەگەڵ دەوڵەتە داگیرکەرەکەی دیکەدا رێککەوتوون. لە مێژووی نەتەوەی کورددا، گەلێ نموونە و ئەزموونی لەو جۆرانەمان هەیە، بەڵام لێرەدا، تەنیا سێ نموونەیان لێ باسدەکەین :

1. دوای ئەوەی جەنگی یەکەمی جیهان تەواوبوو، تورکیا و ئێران لە سەر هێندێ کێشە ناکۆکبوون. لە رۆژهەڵاتی کوردستان،(سمایلاغای سمکۆ) دژی ئێران راپەڕی. داوای سەربەخۆیی دەکرد. پێوەندیی لەگەڵ دەوڵەتی تورکیادا بەتینبوو. تورکەکان لە سەرەتادا یارمەتییاندەدا، تا ئامانجەکانی خۆیان پێکا. کاتێ تورکیا و ئێرانیش رێککەوتن، ئیدی پشتیان تێکرد. سمکۆش تێکشکا و بەرەو باشوور هەڵات.

2. کاتێ جەنگی دووەمی جیهان دەسیپێکرد، رووسەکان بەشێکی ئێرانیان داگیرکرد. کورد لە رۆژهەڵاتی کوردستان راپەڕی. کۆماری کوردستان بە پشتیوانی سۆڤیەت دامەزرا. بەڵام کاتێ ستالین لەگەڵ ئێران رێککەوت، لەشکری سوور گەڕایەوە. ئێران هەموو کوردستانی داگیرکردەوە. لەو ناوەدا کورد بە تەنیا مایەوە، هێندێ لە سەرکردەکان هەڵاتن، هێندێکی دیکەشیان لە سێدارەدران. ئیدی هەموو شت کۆتاییپێهات.

3. لە دوای کۆدەتا سەربازییەکەی(14/یولی/1958)، ناکۆکییە لە نێوان ئێران و عێراقدا دروسبوو. بارزانیی بە هەموو شێوەیە، لە شۆرشی (11/سێپتێمبەر/1961)دا، پاڵی بە ئێرانەوە دابوو، تا بە پیلانێکی نێودەوڵەتیی پشتیانشکاند. ئێران ئەوەی ویستی، دەسیکەوت، ئیدی وازی لە بارزانیی و شۆرش هێنا. چارەنووسی بارزانیی و شۆرشەکەش ئاشکرایە!

ئەمانە، چەند نموونەیەکی زیندووبوون، لە مێژووی نوێی نەتەوەکەماندا روویانداوە. بەڵام ئەورۆ دەبینین، جارێکی دیکەش دووبارەدەبنەوە. ئەم جارە، ناکۆکییەکە لە نێوان، دوو دەوڵەتی داگیرکەری دیکەی، وەک تورکیا و سووریادا خۆی دەنوێنێ. ئەم جارە، بازی کارەسات و لێقەومانەکە، بە سەر

ئۆجەلانەوە دەنیشێتەوە. با بزانین، ئەم رووداوە چیمان بیردەخاتەوە؟ ئێمەی کورد دەتوانین، چ جۆرە پەندێ، لە زەریای ئەم تاقیکردنەوە تفتوتاڵەی (ئۆجەلان و .P.K.K)موە هەڵێنجین. گەر کەمێ بە وردیی، لەم رووداوەی ئۆجەلان وردبیینەوە، دەتوانین، چ جۆرە پەندێکیان لێوە فێربین؟!!

لێرەدا هەوڵدەدەین، باری سەرنجەکانمان بە چەند خاڵێ دەربڕین :

1/ هەرچەندە ئۆجەلان، لە لایەکەوە، بە یەکێ لە سەرکردە رووناکبیرە تێکۆشەرە مەزنەکانی گەلی باکووری کوردستان دادەنرێ. رۆڵێکی گەورەی لە بواری خەباتی کلتووریی، کۆمەلایەتیی، رامیاریی، سەربازیی و دیپلۆماسیدا وازیکردووە. ئۆجەلان تێکۆشەرێکی کوردە، خۆی خۆی پێگەیاندووە، لە سەرشانی یەکێ لە بنەماڵە دەرەبەگ، ئاییینیی، تیرە و هۆزەکانی کوردستان بەرزنەبۆتەوە. پارتی کارگەرانی کوردستانی دامەزراندووە. چەندین ساڵی تەمەنی ژیانی خۆی، لە پێناوی کورد و کوردستاندا بەختکردووە. ئەمە یەکەم جارە، لە دوای سەرۆک بارزانیی، سەرکردەی رێکخراوێکی کوردستانیی بتوانێ، بەو شێوەیە، لە هەموو پارچەکانی کوردستان، جەماوەر لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە.

بەلام لە لایەکی دیکەوە، بە گوتەکانیدا دەردەکەوێ، تا بلێی پیاوێکی کەللەرەق و توورەیە. زۆر شانازیی بە خۆیەوە دەکا. وەک سەرکردەی .P.K.K، رەنگی رێبازێکی دیکتاتۆرانەی، لە نێو رێکخراو و گەلی باکووری کوردستاندا رشتووە. پێوەندیی رامیاریی و نەتەوەیی، لەگەڵ رێکخراوەکانی بەشەکانی دیکەی کوردستان بە گشتیی، لەگەڵ باشووری کوردستان بە تایبەتیی باش نییە. چونکە دوای ئەوەی، جەماوەری گەل لە باشوور راپەڕی، هەڵبژاردن کرا، میریی هەرێم دامەزرا، ئۆجەلان هەڵوێستێکی خراپی، بەرانبەر ئەو تاقیکردنەوە نوێیەی گەلەکەمان دەربڕی. بۆیە شتێکی سەیرنییە، ئەورۆ تورکەکان وەک کوردێ راویدەنێن، هەوڵی لەنێوبردنی دەدەن، کەچی لە بستێکی نیشتمانەکەیدا جێینابێتەوە، پارتەکانی باشوور نەک هەر ئامادەنین، یارمەتییدەن، بەڵکوو هێندێکیان گەر بۆشیان بلوێ، دەسگیریدەکەن و بە باڵبەسراوییی رەوانەی تورکیای دەکەنەوە. هەرچەندە ئۆجەلان، وەک سەرکردەی رێکخراو و شۆڕشێکی

گەورەی باکووری کوردستان، لە نێو گریلادا نەژیاوە. بەڵکوو هەر لە سەرەتاوە، لە لوبنان و سووریا بووە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، زۆر ئازادیی هاتوچۆکردنی نەبووە، بە تایبەتیی لەم سێ ساڵەی دواییدا. لە سووریا وەک دەسبەسەر وابووە!

2/ P.K.K.(لە رووی ئایدۆلۆژیای رامیاریی و شیکردنەوەی باری کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە، بە رێکخراوێکی « مارکسیی ـ لێنینیی » ناوی رۆیشتووە. لە رووی ستراتیژەوە، بە رێکخراوێکی رامیاریی کوردستانی دەناسرێ.) «63،6» لە رووی مەڵبەندی کارگوزارییەوە، بە رێکخراوێکی کوردستانیی دادەنرێ. لە رووی رێکخستنەوە، پێڕەوی سیستێمی دێمۆکراسیی ناوەندیی دەکا. ئەندامەکانی(زۆر کوردانە و کوردستانیانە بیردەکەنەوە. گەلێ دڵسۆزی پارت، نیشتمان و نەتەوەکەی خۆیانن. دیسیپلینێکی بەرز و پتەوی پارتایەتییان هەیە.) «68،6-69» تا بڵێی، پارتێکی رێکوپێک و توندوتۆڵە. ئەمە یەکەم جارە، لە مێژووی نەتەوەی کورددا، پارتێکی وا بەهێز و بەتوانا دادەمەزرێ، ئەو هەموو جەماوەرە زۆرە، لە دەوری ئالاکەی خۆی کۆدەکاتەوە، ئەو هەموو ئەندامە گوێڕایەڵانە پێدەگەیەنێ، فێری دیسپلینێکی توندوتۆڵی پۆلایینیان دەکا. وەک پارتێکی چەپ، جڵەوی تێکۆشانی پارتایەتیی، خەباتی رامیاریی، بزووتنەوەی چەکداریی و سەرکردایەتیی، لە قووڵی مشتی چینی دەرەبەگ ـ نیمچەدەرەبەگ و شێخە ئایینییەکانی کوردستان دەردێنێ. ئەندامەکانی خۆیان، بە شیری پاکی کوردایەتیی راستەقینە پەروەردەدەکەن، بە شێوەیە، ئەو گیانبازییەی ئەوان، لە پێناوی کورد و کوردستاندا دەیکەن، هێشتا لە مێژووی هیچ رێکخراوێکی کوردیی و کوردستانییدا نەبووە و نییە. سەرکردە و رێکخراوەکەی خۆیان زۆر خۆشدەوێ، گەلێ گوێڕایەڵی فەرمانەکانی سەرکردایەتین، سەر و ماڵ و گیانیان، لە ئاستی فەرمانەکانی سەرۆک و سەرکردایەتیی P.K.K.دا دەبەخشن. رێکخراوێ ئەندامەکانی خۆی، بەو شێوەیە پەروەردەبکا، نیوەی ئەو پارەیەی دەسیاندەکەوێ، بۆ پارتەکەیانی تەرخانکەن، بێ ئەوەی دزی لە رێکخراو و گەلەکەیان بکەن. رێکخراوێ بە سەدان ئەندامیان، لە گرتووخانەکانی دەوڵەتی داگیرکەری

تورکیـادا، مـان لە خواردن بگرن، بەربەرەکانییـەکی پاڵەوانانەی ڕژێمی تورکیا بکەن، بەرگەی لێدان و ئازاری جەندرمەکانی تورک بگرن، پێشبڕکێ لەگەڵ مەرگدا بکەن، بۆ ئەوەی یەک تۆز لە ورەیان کەم بێتەوە، بۆ ئەوەی ناپاکیی لە ڕێکخـراو و گـەلەکـەی خـۆیان بکەن. ڕێکخـراوێ بە دەیان هەڤاڵیـان، لە گۆڕەپانەکـانی وولاتانی ئەوروپادا، نارەزایی خۆیان بەرانبەر تورک دەربڕن و خـۆیان بسـووتێنن، ئەمە مـەگـەر هەر لە قـوتابخـانەکـەی P.K.K.دا هەبێ، ئەگـینا نەک هەر تەنیـا، لە نێـو ڕێکخـراوەکـانی دیکەی کـوردسـتـاندا، بەڵکوو لە نێـو هەمـوو ڕێکخـراوەکـانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستیشدا، زۆر بە دەگمەن نموونەی وەک P.K.K. دەبینین. بۆیە دەبێ، لێکۆڵینەوەی تایبەتیی، بێلایەنانە و زانستانە، لە سەر باوەڕ، ڕێکخستن، هەڵوێست و بۆچوونەکانیان بکەین.
لەگەڵ ئەم هەموو خەسڵەتە باشانەی هەشیانە، گەورەترین کەموکوڕیی ئەم ڕێکخـراوە ئەوەیە، لە سـەداسـەد بە هەمـوو بڕیارەکـانی سـەرۆکـەوە بەسراونەتەوە، وەک بت ئۆجەلان دەپەرستن. بە هیچ شێوەیە دیموکراسیی لە نێو ڕیزەکانی P.K.K.دا نییـە. تا ئێستـا ئەندامـانی سەرکـردایەتییـان دیارنین. سکرتێری گشتیی، جێگری نییە. ئەمانەش هەموو وایان لێدەکا، لە ڕۆژێکی ئاوادا، کە ئۆجەلان لێی دەقەومێ، سەرکردایەتی ئەو ڕێکخراوە نەتوانن، بە تەواویی بڕیارێکی کـۆنکرێت بدەن، چی بکەن؟ چ جـۆرە هەنگاوێ بهـاوێژن؟ بەڵکوو تا ئەوڕۆش، لە قـوژبنی گرتووخانەکـەیەوە، بە هۆی دەزگـاکـانی ڕاگـەیاندنەوە، هەر خـۆی بڕیاردەدا! یا گـەر ئۆجـەلان مـرد، دوای ئەوە چارەنووسی ئەو ڕێکخـراوە چی لێ بەسـەردێ؟ کێ جـێی دەگرێتەوە؟ تۆ بڵێی، وەک کورد دەڵێ: گەر مانگا مرد، دۆ ببڕێ!
هەروەها ئەندامـانی P.K.K.، (بۆ لە سـەر خـەباتێکی وشکی ئایدۆلۆژیی دادەگـرن، کـە سـەردەمـەکـەی بە تەواویی کـزولاوازبووە.) «67،6» هەرچەندە ئەوان وا خۆیان پیشاندەدەن، هەموو داگیرکەرانی کوردستان، بە یەک چاو تەماشـادەکەن، باوەڕیان بەو سنوورە دەسکردانە نییە، بەڵام لە ڕاستیدا وا نییە، چونکە کردار و ڕەفتـارەکـانیـان، پێچەوانەی ئەوەی سەلماندووە. ئەوان تورک بە گەورەترین دوژمنی داگیرکەری کوردستان دادەنێن، لەبەرئەوە، دژی

دەوڵەتی تورکیا خەباتی چەکداریی دەکەن. لە هەمان کاتیشدا، پێوەندییەکی باشیان، لەگەڵ هەر سێ دەوڵەتە داگیرکەرەکەی دیکەی ئێران، عێراق و سووریادا هەیە. ئەو پێوەندییە بە شێوەیە بووە، هێندێ جار لە سەر حسێبی خەباتی کوردی، ئەو بەشانەی کوردستان تەواوبووە. بۆیە گەلێ هەنگاوی هەڵەیان ناوە، تاوانیان بەرانبەر کورد کردووە. ئەوە جگە لەوەی، هەر لە زووەوە گوتوومانە: (پێوەندییەکی نابەرانبەر و ناناسایی، لە نێوان P.K.K. و دەوڵەتی داگیرکەری سووریادا هەیە. ئەو پێوەندییە بە شێوەیەکە، لە داهاتوودا مەترسییەکی گەورەی لێ چاوەڕواندەکرێ.) «67،6» گەر ئەوڕۆش، ئەو بەزمە ڕوویداوە، ئەوا شتێکی سەیر نییە و چاوەڕوانکراوبووە!
3/ هیچ کوردێکی دڵسۆز، هیچ ڕێکخراوێکی نیشتمانپەروەر نابێ، باوەڕ بە داگیرکەرانی کوردستان بکا. چونکە داگیرکەر هەر داگیرکەرە، هیچ جۆرە جیاوازییەکیان، لە داگیرکردنی کوردستان و دیلکردنی نەتەوەی کورددا نییە. گەر تەنیا جیاوازییەکیشیان هەبێ، ئەوا لە شێوازی چەوساندنەوەکەدا خۆی دەنوێنێ! لەوانەیە، ئەم داگیرکەر بەهێزتر، بە تواناتر و دەوڵەمەندتربێ، ئەوی دیکەیان بێهێز، بێ توانا و هەژاربێ. ئەمیان نەرمونیانتربێ، ئەوی دیکەیان توندوتیژتربێ. ئەمیان کەمێ باوەڕی، بە سیستێمی دێمۆکراسیی هەبێ، ئەوی دیکەیان پێڕەوی، سیستێمێکی دیکتاتۆریی بکا.
لە بەر تیشکی ئەم ڕاستییانەدا، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، چەندین ساڵە، سەرکردەیەکی وەک ئۆجەلان خەباتدەکا، لە هەمان کاتیشدا، یارمەتییەکی گەورەی ڕژێمی داگیرکەری سووریای داوە، ئەوانیش وەک کارتێکی ڕامیاریی و سەربازیی، دژی تورکیا بەکاریانهێناوە. هەمیشە سەری ئۆجەلان، لای سوورییەکان، لەگەڵ ئاوی فوراتدا یەکسانبووە. کەچی سەرەڕای ئەوەی ئۆجەلان، بە کامی دڵی خۆی، بە(سەرکردەی مێژوویی شۆڕشگێڕی سووریا حافز ئەسەد!)یدا هەڵدەدا، «153،15» لە ناسکترین کاتدا، چۆکیان بۆ هەڕەشەکانی تورکیا دادا، ئەو سووریا پێشکەوتنخوازەی، نەک هەر ئۆجەلان، بە شان و بازوویدا هەڵدەدا، بەڵکوو هەموو سەرکردەی ڕێکخراوەکانی دیکەی کوردستانی مەزنیش، دەهۆڵیان بۆ دەکوتا، ئەو سووریایەی ماوەی پازدەساڵێ دەبێ، نکوڵی لەوە دەکا، ئۆجەلان لە سووریا

بێ، بارەگاکانی .P.K.K کرابنەوە، کەچی لە چاوتروکاندنێکدا، دانی بە هەموو شتێکدا نا! نەک هەر ئۆجەلانی بە ئاسانترین شێوە دەرکرد، نەک هەر بارەگاکانی .P.K.Kی داخست، نەک هەر پەیمانی بە تورکەکان دا، جارێکی دیکە رێگەیان نەدا، بە سووریادا هاتوچۆبکەن، بەڵکوو بە هەر دەپەنچە، بۆی مۆرکردن، ئۆجەلان تیرۆریستە و .P.K.Kکەش رێکخراوێکی تیرۆریستییە. ئەوە لە کاتێکدا، ئەوەی ئۆجەلان بۆ سووریا بە تایبەتیی، بۆ فەلەستین و لوبنان بە گشتیی کردی، هێندەی خۆێنی رۆڵەکانی کوردی بۆ عەرەب رشت، کەم عەرەب هەیە، بۆی کردبێ! لە کاتێکدا ئۆجەلان، لە بەر خاتری چاوی کالی، سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری سووریا، پازدە هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەی، لە خاکی خۆراوای کوردستان دابڕی، (نکولی لە بوونی کوردستان لە سووریادا دەکرد)«167،15»، کەچی چونکە سووریا، هەر لە یەکەم رۆژەوە، وەک دەوڵەتێکی داگیرکەر، هەڵسوکەوتی لەگەڵ (ئۆجەلان و .P.K.K) بە تایبەتیی و هەموو نەتەوەی کورد بە گشتیی کردووە، هەموو ئەو ئەرک و راژەکردنەی ئۆجەلان، بایی ئەوەندە نەبوو، لە ژێرزەمینێکی سووریادا بیشارنەوە! ئەمە پەندێکە، پێویستە، هەموو سەرکردەی رێکخراوەکانی کوردستان کەڵکی لێوەربگرن.

هەرچەندە، هەر ئۆجەلان خۆی بوو، کاتێ هەر دوو شالیاری دەرەوەی تورکیا و سووریا (فاروق ئەلشەرع و سمایل جیتم) لە مانگی مارسدا، پێکەوە لە شاری « دەوحە » کۆبوونەوە، هەواڵی نزیکبوونەوەیان دەدا، هێندە باوەڕی بە دەوڵەتی داگیرکەری سووریا هەبوو، لەو بارەیەوە هێندە کورتبینبوو، دەیگوت: (پێشکەوتنی پێوەندییەکانی نێوان هەر دوولا، بە هیچ جۆرێ نامانترسێنێ، بەڵکوو بە تەواویی بە پێچەوانەوەیە.)«18،17» هەروەها لەبەرئەوەی، دڵی هەر سێ دەوڵەتە داگیرکەرەکەی ئێران، عێراق و سووریا رابگرێ، دژی هەموو دەسکەوتەکانی گەلی باشوور دەجولایەوە! ئەو دەسکەوتانەی بە دژایەتیکردنی خۆی دادەنا. پێی وابوو، گەر دەوڵەتێکی کوردیی دابمەزرێ، وەک خەنجەرێ لە پشتی دەچەقێ. بۆیە بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی، بە هەموو شێوەیە، بەر بە دامەزراندنی بگرێ! ئەوەتا زۆر بە راشکاویی دەڵێ: (هەر لەبەرئەوەشبوو، لە باشوور، بە

شێوەیەکی زۆر توندوتیژ و چڕوپڕ، بەرەو قۆناغی بەرگریکردن هەنگاومانا.
گەر بهاتایە، ئەو قەوارەیە دابمەزرایە، هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆی لە باکووری جیهانی عەرەب، خۆراوای ئێران و هەموو گەلانی نێوچەکە دەکرد. بەڵام توانیمان، ئەو مەترسییە بوەستێنین.)«19،17» کەچی سەیر ئەوەیە، چ عێراق و چ سووریا، کاتێ ئۆجەلان لێیقەوما، نقەیان لێوە نەهات، بە هیچ شێوەیە، پاداشتی ئەو قسانەیان نەدایەوە، بەڵکوو بە یەک هەڕەشەی تورک، وازیانلێهێنا، ئەوەیە پاداشتی داگیرکەران! کورد چاکی فەرمووە:(هەزار ساڵ بکەی بێگانەپەرستیی، ئاخری هەر دەهێنی نووشوستیی)!
تەنانەت سەرانی دەوڵەتی ئێران، هەر زوو جرتوفرتیان دەسپێکرد، زۆر بە کوڵودڵەوە هەوڵیاندەدا، لە نێوان تورکیا و سووریادا، ناوبژیبکەن. کاتێ هەر دوولاش، لە سەر حسێبی ئوجەلان ڕێککەوتن، ئێرانییەکان گوتیان: سووریا ڕێگایەکی ژیرانەی هەڵبژارد. بە مەرجێ ئۆجەلان، تا ئێستا لە گوڵ کالتری، بە دەوڵەتی داگیرکەری ئێران نەگوتووە! تەنانەت هەمووی پێش چەند مانگێ بوو، گریلاکانی.P.K.K، نۆ کوردی شۆڕشگێڕی ڕۆژهەلاتیان کوشت، تەرمەکانیان بە دیاری پێشکەش بە ئێران کردەوە، ئێرانیش ئەوە هەڵوێستیانبوو! جگە لەمانەش، ئەوەتا ئێران داوا لە سەرانی تورکیا و سووریا دەکا، کۆبوونەوە سێقۆڵییەکانی جارانیان زیندووبکەنەوە، تا بەر بەو تاقیکردنەوەیەی باشووری کوردستان بگرن، پرۆسەی ئاشتیی تێکبشکێنن، هەر تروسکایی یەک، لە هەر پارچەیەکی کوردستاندا بگرێ، هەر زوو بە هەر سێلایان بیکوژێننەوە.
4/ ئێمە تا ئێستا، چەندین جار، ئەوەمان دووپاتکردۆتەوە :
یەکەم ـ هەڵکەوتی باری جیۆپۆلیتیکی کوردستان، لە پێناوی مافی (ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی)دا، خەباتی چەکداریی هەڵناگرێ. ئەو خەباتە، پتر لەگەڵ سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتی ناسیۆنالدا دەگونجێ.
دووەم ـ مۆدێلی خەباتی چەکداریی، لە مێژە بەسەرچووە. لە هەر پارچەیەکی کوردستاندا، هەرچی نەگبەتیی، ماڵوێرانیی و بەڵا هەیە، هەر لە کۆنەوە یەخەی کوردی گرتووە، هەمووی لە ئەنجامی ئەو شێوە خەباتە سەختەدابووە.
گەر خەباتی چەکداریی نەبووایە، چۆن هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکە

دەیانتوانی، چ بە نهێنی و چ بە ئاشکرا، دەس لە کاروباری نێوخۆی، پارچە جیاجیاکانی کوردستان وەردەن؟ چ بە کۆمەکی مرۆیی و چ بە کۆمەکی سەربازیی، سەرکردەی ڕاێکخراوەکان ڕستکەن؟ لە پێناوی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیاندا، هەڵیانسوڕێنن! گەر خەباتی چەکداریی نەبووایە، بۆچی هەر جارەی بە نۆرە، ڕێکخراوەکان لەشکری دەوڵەتە داگیرکەرەکانی (تورکیا، ئێران و عێراق)یان، بۆ سەر یەکدی دەهێنا؟ بۆچی بە دەسی خۆیان، لە ژێر دروشمی ناچاریدا، ناپاکییەکی گەورەی مێژوویی یان، بۆ خۆیان و ڕێکخراوەکانیان تۆماردەکرد؟

لێرەدا سەیر ئەوەیە، هەموو ڕێکخراوە رامیاریی یەکانی کوردستانی مەزن، داوای(ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی)دەکەن، کەچی دەیانەوێ، ئەو مافە سەرەکییە دیموکراسییانە، بە شۆڕشی چەکداریی بەدیبێنن! لە کاتێکدا، تاقیکردنەوەی گەلانی ئازادیخوازی جیهان، ئەوەی سەلماندووە، خەباتی چەکداریی و (ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی)، وەک حوشتر و قاپقاپ وان، بە هیچ شێوەیە ڕێک ناکەون. چونکە جوڵانەوەی چەکداریی دەبێ، تەنیا لە پێناوی ئازادیی، سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی ناسیۆنالی تایبەتیدا بکرێ!

بەڵێ گەر ڕێکخراوەکان، پەندیان لە وانەکانی مێژوو وەربگرتایە، هەڵبەتە، لە دوای شۆڕشەکانی(شێخ سەعیدی پیران، ژەنەراڵ ئیحسان پاشا و سەیید ڕەزا) لە باکوور، لە دوای شۆڕشەکانی(سمکۆ و کۆماری مهاباد) لە ڕۆژهەلات، لە دوای زنجیرە شۆڕشەکانی(شێخ مەحموود و سەرۆک بارزانیی) لە باشووری کوردستان، هەرگیز بیریان لە شۆڕشی چەکداریی نەدەکردەوە. چونکە هیچ نەتەوەیە، بە قەدەر نەتەوەی کورد، لە خەباتی چەکدارییدا، زیانی لێ نەکەوتووە. لەبەرئەوە، سێ شت هەیە، دەبێ، بە باشی بیزانین :

یەکەم ـ خەباتی چەکداریی، گەر بۆ سەردەمێکی دیاریکراویش گونجاو بووبێ، ئەوا ئەورۆ سەردەمەکەی بەسەرچوو.

دووەم ـ کورد نەتەوەیەکی بێ پشت و پەنایە، دۆستی ستراتیژیی نییە، بۆیە تەنیا بە خەباتی چەکداریی ناتوانێ، ئامانجە نەتەوەیی یەکانی خۆی

بەدەسبێنێ. هیچ گەلێکی ئەم جیهانەش، بە تەنیا بە هێزی بازووی خۆی، خۆی ڕزگارنەکردووە، بەڵکوو هێندێ لە دەوڵەتەکانی جیهان، یارمەتییەکی زۆریان داوە، تا سەربەخۆیی چنگکەوتووە.
سێیەم ـ خەباتی چەکداریی، گەر لە ماوەیەکی کورتدا، ئامانجەکانی خۆی نەپێکا، ئەوا جگە لەوەی شۆڕشگێڕەکان ماندوودەبن، لە هەمان کاتیشدا، ناکۆکیی و دووبەرەکییەکی گەورە، لە نێوان ڕیزەکانی گەلدا دروسدەکا، پاشان جەنگی نێوخۆی لێدەکەوێتەوە، هێندێ جاریش بە ناپاکیی کۆتاییدێ.
بۆیە گەر ڕێکخراوەکان، لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا، ئەم شۆڕشە چەکدارییەیان بەرپانەکرادیە، هەڵبەتە، یەکێکی وەک سەرۆک بارزانیی، ئاوارەی ئەمەریکا نەدەبوو، بە دەربەدەریی سەری نەدەنایەوە. یا یەکێکی وەک ئۆجەلان، پێویستی بەوە نەدەکرد، بە دەوڵەتەکانی جیهاندا بخولێتەوە، هیچ دەوڵەتێکیش لە ترسی تورک و ناتۆ، لە بەر بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان، جێگەی نەکەنەوە، تەنانەت وەک پەنابەرێکیش وەرینەگرن. بەڵکوو ئەمەریکای ئاغاشیان دەیەوێ، ئۆجەلان لە هیچ شوێنێکی ئەم جیهانەدا دالدەنەدرێ، وەک تیرۆریستێ ڕەوانەی تورکیا بکرێتەوە. یا دەیانەوێ، وەک تاوانباری جەنگ، دادگایی بکرێ! ئەوە لە کاتێکدا دەبووایە، دەیانی وەک(سەددام حوسێن)ی خوێنڕێژ دادگایی بکرایە، کە بەرانبەر بە خوێنی چەندین میلیۆن مرۆڤ بەرپرسیارە، بەڵام چونکە ئەو دەوڵەتی تایبەتیی خۆی هەیە، دەوڵەتەکان ناتوانن، بڕیارێکی لەو بابەتە بدەن!!!
پێموایە، کاتی ئەوەمان هاتووە، سەرکردە و ئەندامانی سەرکردایەتی ڕێکخراوەکان، زۆر بە کوڵوکڵ، بیر لەم کێشە گرنگە بکەنەوە. بە هەر شێوەیە بێ، زمانێکی هاوبەش، لەگەڵ دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا بدۆزنەوە، لە هەر پارچەیەکی کوردستاندا، بە شێوەیەکی ئاشتییانە، چارەسەرێکی نیوەناچڵی دیمۆکراسییانە، بۆ کێشەی کورد بدۆزنەوە، تا گۆڕانکارییەکی دیکەی گەورە، لە جیهاندا ڕوودەدا، تا هەلێکی دیکەی مێژوویی بۆ کورد هەڵدەکەوێ، بە شێوەیەکی بنەبڕیی، چارەسەری کێشەکەی دەکرێ و دەوڵەتی یەککرتووی ناسیۆنالی خۆی دادەمەزرێنێ. با لەم بوارەدا،

چاو لە تاقیکردنەوەی فەلەستینییەکان بکەین. ئەوان زۆر ئازایانە، لە ساڵی (1988)ەوە، وازیان لە خەباتی چەکداریی هێناوە. ئەوەتا ئەورۆ دەبینین، کەڵکیان لە گۆڕانکارییەکانی جیهان وەرگرتووە، خاوەنی دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمیی خۆیانن، ڕۆژبەڕۆژیش، پرۆسەکەیان بەرەو پێشەوە دەڕوا، لە ئایندەیەکی نزیکیشدا، دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆیان دادەمەزرێنن. بەڵام گەر هەر لە سەر خەباتی چەکداریی بەردەوامبوونایە، لەگەڵ ئیسرایلدا تا سەر بیانکێشلایە، باوەڕناکەم، جگە لە تیرۆریست، بە شێوەیەکی دیکە ناویان بهاتایە و بە هیچ ئامانجێکی خۆشیان نەدەگەیشتن!
5/ ئەم تاقیکردنەوەیەی ئۆجەلان، دیسانەوە ئەوەمان فێردەکا، ڕێکخراوەکانی کوردستان. چەند بە دەسەڵاتبن، چەند بە توانابن، چەند پارەوپولیان زۆربێ، چەند خاوەنی دەزگایەکی ئابووریی پتەو و سەربەخۆبن، چەندین هەزار ئەندامیان، لە ڕیزی پارتەکەیاندا ڕێکخستبێ، خاوەنی سوپایەکی مەشقپێکراوی گوێڕایەڵ و زۆریش بن، هەر کاتێ سەرکردەی ڕێکخراوەکە بە تایبەتیی، یا جوڵانەوە ڕامیاریی و چەکدارییەکە بە گشتیی، تووشی گرفتێکی گەورە بوون، لێیان قەوما، لە نێو چوارچێوەی چوار دەوڵەتەکە و لە سنووری دەوڵەتەکانی نێوچەکەدا، تەنانەت لە گۆڕەپانە نێونەتەوەیی یەکەشدا، بە پلەی یەکەم، بەرژەوەندیی نێو دەوڵەتان، ڕۆڵی سەرەکیی دەبینێ. ئەگینا لە مێژووی کورددا، بە دەیان جار، کارەساتی گەورە و دڵتەزێن، بە سەر نەتەوەیەکی مەزنی وەک کورد هاتووە، کەس گوێی خۆی بۆ لە خوم نەداوە! کێشەی کورد و شۆڕشە ڕەواکانی لە نێوچەکەدا، تەنیا وەک جوڵانەوەیەکی ئاژاوەچیی، گێرەشێوێن، یاخیبوو، تێکدەر، تیرۆریست و جیاوازیخواز تەماشاکراون، هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی دیکەیان بۆ نەکراوە، تا سەریش، هیچ جۆرە پشتوپەنایەکی نەبووە. کەچی دەوڵەتێکی بچکۆلانەی وەک (کوێت)، ژمارەی دانیشتووانی دوو میلیۆن نابێ، کاتێ عێراق پەلاماریدا، بە سی دەوڵەت پەلاماریان دایەوە و لە کوێتیان دەرپەڕاند.
6/ هەموو داگیرکەرانی کوردستان، بە یەک چاو لە سەرکردە و ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستان دەڕوانن. یەک حسێبیان بۆ نەتەوەی کورد کردووە.

هەموویان لە یەک ئامانجی سەرەکیدا یەکدەگرنەوە، ئەویش ئەوەیە، هەرگیز کورد بە هیچ نەبێ، بەشە کوردستانەکەی بندەسیان لە کیسنەچێ، تا دەتوانن، بە گژ یەکدیاندا بکەن، ئاساییش و ئارامیی لە کوردستاندا نەبێ، بۆ ئەوەی بە ئاسانترین شێوە کورد بتوێننەوە. لای ئەوان کوردی هیچ پارچەیە، لەگەڵ کوردی پارچەکەی دیکەدا جیاوازیی نییە. چونکە پێیانوایە، کورد لە هەر پارچەیەکدا، فشەمافێکی دەسکەوێ، لە دوارۆژێکی نزیک یا دووردایێ، کار لە هەست و هۆشی، کوردی هەموو پارچەکانی دیکە دەکا، ئەوانیش وەک شارە زەردەواڵە، لێیان دەورووژێن، داوای مافە ڕەواکانی خۆیان دەکەن، وەک ئێستا بە ئاشکرا، لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا دەیبینین.

7/ هەرچەندە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، لە نێوخۆیاندا زۆر ناکۆکیشبن، چەند ساڵ جەنگی خوێناویی، لە نێوانیاندا ڕوبدا، بەڵام هەمیشە هەموویان، لە چارەسەرکردنی کێشەی کورددا، یەک باری سەرنجیان هەیە. هەموویان یەکدەگرن، هێز و توانایان یەکدەخەن، دەوڵەتەکانیان لە مەترسیی جوڵانەوەی کورد و پارچەپارچەکردن ڕزگاردەکەن. چونکە بە هیچ شێوەیە، هیچ دەوڵەتێکی داگیرکەری کوردستان، باوەڕ بە هیچ ڕێکخراوێکی ڕامیاریی کوردستان ناکا. واتا ئەوان، بۆ لەنێوبردنی کورد، هەمیشە یەکدەگرنەوە. کەچی بە پێچەوانەوە، هەرگیز کورد، بۆ سەربەخۆیی و بەربەرچدانەوەی داگیرکەران یەکناگرێتەوە. تەنیا لە یەک شتدا یەکدەگرنەوە، ئەویش ناکۆکیی و دووبەرەکییە. هیچ لایە دان بە لاکەی دیکە و هیچ سەرکردەیە دان بە سەرکردەکەی دیکەدا نانێ. بۆیە هەمیشە، یەکێ لە ڕێکخراوەکان، وەک بەرخی نێر، خۆیان بە قوربانی نەخشە و پیلانەکانی، یەکێ لە دەوڵەتە داگیرکەرەکان کردووە، دژی هاوزمان و هاونیشتمانەکانی خۆیان ڕاوەستاون، داگیرکەرەکەش بۆ خۆی حەواوەتەوە. کورد لە نێوخۆدا یەکگرتوونییە. تەنانەت دەوڵەتە داگیرکەرەکان، چەند لە نێوخۆشیاندا ناکۆکبن، کورد کەڵک لەو ناکۆکییانەش وەرناگرێ.

8/ ئەم ڕووداوەی ئۆجەلان، شتێکی دیکەمان بۆ دەسەلمێنێ، ئەویش ئەوەیە، کورد تەنیا لە ڕۆژانی تەنگانە و لێقەوماندا، بیر لە یەکێتیی،

تەبایی، برایەتیی و لاوازیی خۆی دەکاتەوە. گەلێ جار، تەنیا کارەساتێکی گەورەی نەتەوەیی جوڵاندوویەتی، وەک لە سێدارەدانی سەرکردەیەکی کورد، هەرەس، کیمیابارانی کوردستان و ئەنفالەکان، هەموو لایەکی کۆکردۆتەوە، هەست و هۆشی هەموو ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی، لە ناخەوە هەژاندووە. هەموو لاکـان بیـریان لە بێکەسـیی، بێـدەسـەڵاتیی، لاوازیی، بێـتـوانایی و لێقەوماویی کورد کردۆتەوە. ئەوڕۆش دەبینین، زۆربەی زۆری کورد، دژی داواکـارییـە نارەواکـانی تورک و ئەمـێـریکا ڕادەوەستن، داوای ئازادیی و سەفـرازیی بۆ ئۆجـەلان دەکـەن. هەرچەندە ئەمـەش خـۆی لە خـۆیدا، هەر دەرکەوتەیەکی باشە، جارێکی دیکە، یەکێتی ڕیزەکانی کورد بەهێزدەکاتەوە، هێزێکی مرۆیی گەورەی کوردیی، پیشانی دۆست و دوژمنانی نەتەوەکەمان دەدا. بەڵام بریا هەمـیـشە کـورد، لە نێـوخۆدا کـۆک و تەبابووایە، لە ڕۆژانی خەبات و ئاشتیشدا، یەککرتووبووایە، ئینجا دەمانبینی، چۆن سەردەکەوت! ئینجا دەمانزانی، چۆن دوژمنان دۆشدادەمان، بە هیچ شێوەیە نەیاندەتوانێ، پشتی کورد لە زەوی بدن و زەفەری پێبەرن!

9/ بە ڕاستیی، بۆ نەتەوەیەکی چل میلیۆنی وەک کورد، بۆ خاکێکی گەورە و پانوبەرینی پێنجسـەدهەزار کـیلۆمـەتری چوارگۆشەی وەک کـوردسـتـان، مـایەی شـەرمەزارییە، گـەر نەتوانرێ، لە گۆشـەیەکی نیـشـتـمـانەکـەمـاندا، یەکێکی وەک ئۆجـەلان داڵدەبدرێ. لە کـاتێکدا، بە سـەدان ئۆپۆزیسـیۆنی عـەرەب، فـارس و تورک، لە دەس ڕژێـمـەکـانی خـۆیان هەڵهـاتوون، لە کوردسـتـانی بندەسی خۆیاندا جێگایان بۆتەوە، ڕێزیان لێ دەگیرێ، کـەچی سەرکـردەیەکی تێکۆشـەری وەک ئۆجەلان، بە هیچ شـێـوەیە ناوێرێ، ڕوو لە بستێکی نیشتمانەکەی خۆی بکا! لەوانەیە، ئەمەش بۆ دوو هۆ بگەڕێتەوە :

یەکەم ـ سەرانی ڕێکخراوەکان ناوێرن، لە ترسی تورک داڵدەی بدەن.

دووەم ـ پێـوەندیی ئۆجـەلان، لەگـەڵ سـەرکـردەی ڕێکخـراوەکـانی دیکەی پارچەکانی کوردستاندا باش نییە.

10/ ئێمە لە باشووری کوردستاندا دەبینین، ماوەی سیوحەوت ساڵ دەبێ، خەباتی چەکداریی دەکرێ، بێ ئەوەی تا ئێستا هیچمان دەسکەوتبێ. دوو سەرکردەی وەک(بارزانیی و تاڵەبانیی)ش، بە خۆیان و پارتەکانیانەوە، بە

شێوەیەکی بەردەوام کاردەکەن و تا ئەورۆ ماونەتەوە. بە ئاشکرا دەتوانن، کاربکەن، بێن و بچن. وا دیارە، لە لایەکەوە ئەوان بە قەدەر ئۆجەلان، هەم مەترسییان بۆ سەر داگیرکەرانی کوردستان نییە. هەم دژی بەرژەوەندییەکانی ئیسرایل و ئەمێریکا نین. چونکە ئەوان زۆربەی کات، زۆر بە ئاسانیی و بە ئاشکرا، بە ئاسمانی ئەو چوار دەوڵەتە داگیرکەرانەدا، وەک کۆتری ئاشتیی، لە شەقەی باڵدەدەن و دەفرن، بێ ئەوەی کەسێ ڕێگەیان لێ بگرێ یا هەوڵی لەنێوبردنیان بدا! دیارە، گەر ئۆجەلانیش لە باکووری کوردستان بووایە، لە سەر پەتی ناکۆکییەکانی، ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانە یاریبکردایە، هەڵبەتە ئەویش وەک ئەوان دەمایەوە.
لە لایەکی دیکەشەوە، گەر ئۆجەلان نەخشە و پلانەکانی، دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانی، بە تەواویی جێبەجێبکردایە، هەر ڕۆژەی لەشکری دەوڵەتێکی داگیرکەری، بۆ سەر لایەنێ لە لایەنەکان کێشبکردایە، هەڵبەتە زۆر بە ئاسانیی دەیتوانی، لە یەکێ لەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی وەک ئێران و عێراقدا، جێگەی خۆی بکاتەوە، وەک پشیلەی حەوت گیانی لێبێ، بە هیچ داگیرکەرێکی کوردستان نەکوژرێ!
11/ ئەم ڕووداوە، دۆست و دوژمنی نێوخۆ و دەرەوەی، بۆ نەتەوەکەمان بە گشتیی و P.K.K. بە تایبەتیی ئاشکراکرد. لە لایەکەوە، هەموو ئەو کەسایەتیی، ڕێکخراو و دەوڵەتانەی، لەگەڵ ئەوەدابوون، پەنابەریی رامیاریی بە ئۆجەلان بدرێ، وەک دۆستێکی نەتەوەکەمان ناسران. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەوانەی دژی ئۆجەلان بوون، بە تیرۆریست تاوانباریاندەکرد، داوایان لە ئیتالیا دەکرد، ڕەوانەی تورکیا بکرێتەوە، وەک دوژمنێ دەسەکانیان کەوتەڕوو.
12/ سەرکردایەتی P.K.K.، لە پێش هەمووشیانەوە ئۆجەلان، پێویستە، بە نەخشەی ستراتیژیی، رامیاریی، سەربازیی، پێوەندیی خۆیان و باڵەکانی دیکەی بزووتنەوەی کوردایەتیدا بچنەوە. چاوێ بە بەرنامەی کار و پێوەندییەکانیان لەگەڵ داگیرکەراندا بخشێننەوە. پێبەپێی باروەدۆخە نێونەتەوەیی یە نوێکە، هەنگاوبنێن. ڕێز لە ویست و ئارەزوو، دید و بۆچوونەکانی، جەماوەری نەتەوەکەمان بگرن. بناغەی پێوەندییەکی نوێی

توندوتۆڵ، لەگەڵ جەماوەردا دابڕێن. واز لە لەخۆباییبوون، کەللەڕەقیی، توندوتیژیی، پەرگیریی، تۆڵەسەندنەوە و پاوەنخوازیی بهێنن. لە نێو ڕێکخراوەکەی خۆشیاندا، پرۆسێسێکی دیمۆکراسییانە پیادەبکەن. دان بە هەڵەکانی خۆیاندا بنێن، کەڵک لەم ئەزموونە گەورەیە وەرگرن، تا جارێکی دیکە، تووشی تراژیدیای لەو چەشنە نەبنەوە. ئەگینا گەر هەر لە سەر، ڕێوشوێنە کۆنەکەی خۆیان بڕۆن، باوەڕناکەم، سەد ساڵی دیکەش بمێنن، تێبکۆشن، هیچ بە هیچ بکەن!

13 / با بە ئاسپایی، شتێ بە گوێی زۆڵەکوردەکاندا بچرپێنین، با تورکیای ئەتاتورکیش باش بزانێ، ئەوەتەی تورکەکان ئیمپراتۆریای عوسمانییان لە تورکیای ئەوڕۆدا دامەزراندووە، هەوڵی تواندنەوەی کورد دەدەن، بەڵام تا ئەوڕۆ نەیانتوانیوە، ئامانجە گڵاوەکانیان بەدیبێنن.
کاتێ ساڵی(1923)، کۆماری تورکیا دامەزرا، ژمارەی دانیشتووانی کورد، لە باکووری کوردستاندا، نزیکەی دوو میلیۆن دەبوو، کەچی لەگەڵ ئەو هەموو چەوساندنەوە، ژینۆسایید، ڕاگواستن و تواندنەوەیەدا، ئەوڕۆ دوای حەفتاوپێنج ساڵ، نەک هەر کورد نەتواوەتەوە، بەڵکوو ژمارەی کورد دە هێندەی دیکە زیادیکردووە. لەبەرئەوە، باشتر وایە، سەرانی تورک، هۆشێ بە بەر خۆیاندا بێننەوە، کێشەی کورد بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە و دیمۆکراسییانە چارەسەربکەن، نەک هەر وەک لە کۆنەوە، قەوانە سوواوەکەیان لێدەدەنەوە و دەڵێن:(لە هەر کوێ خەنجەری تورک لە کێلانەکەی هەڵکێشرا، گیروگرفتی کورد لەو جێیە تەواودەبێ.)«4، 202»
یا دەڵێن:(ئەوەی لەم وڵاتەدا لە ڕەگەزی پاکی تورک نەبێ، تەنیا یەک مافی دەکەوێ، مافی خزمەتکاریی و کۆیلەیی)«4، 201-202».

14 / هەرچەندە تورکەکان، لەو ڕۆژەوە کوردستانیان داگیرکردووە، هەوڵی تواندنەوەی کوردیان داوە، بەڵام تا ئەوڕۆ نەیانتوانیوە، گەلی باکووری کوردستان لەنێوبەرن. هەرچەندە تورکەکان توانیویانە، یەک لە دوای یەک، هەموو شۆڕشەکانی کورد، زۆر بێبەزەیی یانە بکوژێننەوە، بەڵام تا ئەوڕۆ نەیانتوانیوە، گڕ و کڵپەی ئاگری شۆڕشەکانی دیکەی کورد دامرکێننەوە.
هەرچەندە تورکەکان توانیویانە، چەندین سەرکردەی قارەمانی وەک

(میربەدرخان، یەزدانشێر، شێخ عوبێدوڵلای نەهری، شێخ سەلیم، شێخ سەعیدی پیران، دوکتۆر فوواد، شێخ عەبدولقادر و سەیید ڕەزا ... تاد)یان دەربەدەرکرد و لەنێوبرد، بەڵام تا ئەورۆ نەیانتوانیوە، وزە لە نەتەوەکەمان ببڕن، ڕێگە لە پێگەیاندنی سەرکردەی نوێ بگرن.
هەمووومان دەزانین، شۆڕشی دەرسیم، لە ساڵی1937دا، زۆر بە شێوەیەکی درندانە سەرکوتکرا، سەرکردەی شۆڕشەکەشیان، لە تەمەنی حەفتاوپێنج ساڵیدا لە سێدارەدا. لێرەدا بە پێویستی دەزانم، سەرنجی خوێنەران، بۆ دوا گوتەکانی، شەهید « سەیید ڕەزا » ڕابکێشم، تا بزانن، چی گوتووە.
بەڵێ، شەستویەک ساڵ لەمەوبەر، شەهید فەرموویەتی :(هەر وەک ئاگاتان لێیە، بزووتنەوەکەی دەرسیم شکا، بەڵام کورد و کوردستان هەروا لە سەر پێی خۆی ڕاوەستاوە، ژیانی خۆی ڕادەبوێرێ، هەرگیزاوهەرگیز نامرێ. گەنجەکان بە هیچ چەشنێ نایەڵن، ئەو بزووتنەوەیە بکوژێتەوە. ئەوان تۆڵەی من دەستێننەوە، بژی کورد و کوردستان، بڕوخێ دەزگای زاڵمان، ستەمکاران و نەفرین لێبووان)«212،9»دیارە سەرکردەی شەهید ڕاستی فەرمووە، کورد نەتوایەوە و کوردستانیش بزرنەبوو، کوانووی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکەشی، بە ڕژێمە یەک لە دوایەکەکانی تورک نەکوژایەوە. بە زیادیشەوە تۆڵەی سەیید ڕەزا و شەهیدەکانی دیکەیان، لە سوپای تورک سەندەوە. گەر شۆڕشی دەرسیم تێکشکا، کەچی دوای نزیکەی پەنجا ساڵ، جارێکی دیکە شۆڕشی.P.K.K بەرپابۆوە. گەر سەیید ڕەزا نەما، کەچی دوای ئەویش، چەندین خونچەگوڵی سەرکردەی دیکە، لە باخە گەورە گەشەکەی نەتەوەی کورددا پشکوت. بۆیە گەر ئەورۆش تورکەکان، ئۆجەلان لەنێوبەرن، سبەینێ بە دەیان ئۆجەلانی دیکە لەدایکدەبێ و پێدەگا. گەر تورکەکان هەر لە سەر ویستی خۆیان بەردەوامبن، بیانەوێ، گەلی باکووری کوردستان تووبڕبکەن، وەک ئەوە وایە، خەو بە دەسەڵاتی ئیمپراتۆریای عوسمانییەوە ببینن! ئەگینا گەر کورتبین نەبن، ئەو جۆرە وڕێنانە ناکەن. تورک خەیاڵی خاوە، هەرگیزاوهەرگیز، کورد نامرێ، دەبێ، تا ماون، هەر بەو داخەوە سەربنێنەوە. بەڵام سەرشۆڕیی، ڕووڕەشیی و مردن، تەنیاوتەنیا بۆ خۆفرۆشان و داگیرکەرانی کوردستانە، لاپەڕەکانی مێژووش، گەواهیی قسەکانمان دەدەن!

بۆیە هیچ کوردێ نابێ، لەوە زیاتر بنێشتەتاڵی ژێر دانی داگیرکەران بجوێتەوە. کورد نەتەوەیەکی ئازا و قارەمانە، ژمارەی دانیشتووانی چل میلیۆنێ دەبێ، کەچی تا ئێستا، لە هەموو مافێکی نەتەوەیی و مرۆیی بێبەشکراوە. لە نیشتمانەکەی خۆیدا، بە خراپترین شێوە دەچەوسێندرێتەوە. کورد دوا نەتەوەی ئەم جیهانەیە، لە پێناوی ژیان، ئازادیی، سەربەخۆیی و سەلماندنی بوونی خۆیدا، خەباتی چەکداریی دەکا. ئیدی با هەموو ئەو کوردە بێ هۆش و گۆشانە، باش بزانن، کورد نە دەتوانێ، شۆڤێنیی بێ، نە هەرگیزاوهەرگیزیش تیرۆریست بووە. گەر یەک تیرۆریست لەم جیهانەدا هەبێ، تەنیاوتەنیا، سەرانی هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەی کوردستانن.
ئایا ئەوانەی، چوار هەزار گوندی کوردستنیان سوتاند و ڕوخاند، بە هەزاران خەڵکی بە ڕوومەتی کوردیان، لە قوژبنی زیندانەکانی تورکیادا توندکردووە، بە سەدان کورد لە سەر جادەکانی تورکیا دەکوژن، تیرۆریستن یا کورد؟!! ئایا ئەوانەی، (قاسملۆ و شەرەفکەندیی)یان لە ئەورووپا تیرۆرکرد، تیرۆریستن یا کورد؟!! ئایا ئەوانەی، بە هەزاران کوڕی کوردیان، لە گرتووخانەکانی عێراقدا لە داردا، زۆربەی زۆری گوند و شارۆچکەکانی کوردستانیان وێرانکرد، هەڵەبجە و نێوچەکانی دیکەی کوردستانیان کیمیابارانکرد، هەشت ئەنفالی گچکە و گەورەیان کرد، هەشت هەزار بارزانیان کوشت، سەدوهەشتاودووهەزار کوردی بێچارەیان گوللەبارانکرد، تیرۆریستن یا کورد؟!! ئایا ئەوانەی، لە سەرەتای ساڵەکانی شەستەوە، هەموو خۆراوای کوردستانیان بە عەرەبکرد، ئەوانەی نوزەیان لە مرۆڤی کورد بڕیوە، ئەوانەی تا ئەوڕۆش ڕەگەزنامەی سووریا، بە کورد نادەن، تیرۆریستن یا کورد؟!!
کارەساتێکی نەتەوەیی زۆر گەورەیە، تاڵەبانیی و بارزانیی، دەم لە نێو دەمە بۆگەنەکەی، سەددامێکی دیکتاتۆری تیرۆریستی شەلاتی پیاوکوژ دەنێن، زۆر بە گەرمیی دەسی مەسعوود یەڵمازێکی سەرسەریی و تلیاکفرۆش دەگوشن، کڕنووش بۆ مەلا دواکەوتووەکانی ئێران دەبەن. کەچی ناتوانن، لەگەڵ برا کوردە هاوخوێن و هاوزمانەکانی خۆیاندا ڕێککەون، یەکدی لە ئامێزبگرن، دەسی یەکدی بگوشن، برایەتیی و یەکێتی نەتەوەیی سازکەن! لە بری ئەو برایەتیی و یەکێتی نەتەوەیی یە، زۆر بە ئاسانیی بارەش بۆ

سەرانی تورک دەکەنەوە، پەیمانیان بۆ نوێدەکەنەوە، تا پارێزگاریی سنوورەکانی تورکیایان بۆ بکەن، P.K.K. بە تیرۆریست دادەنێن و چەند جارێ، لە ڕێککەوتننامەکەی نێوان پارتی و یەکیتی لە واشنتۆن، ئەوە تۆمار دەکەن.«3-2،16 » وەک تورکیا خۆی دەس و قاچی شکابێ، ئەستۆی وردبووبێ! دیارە، سەرکردەی ئەم ڕێکخراوانە، تامەزرۆی ئەوەن، هەمیشە نازناوی پاسەوانی سنوورەکانیان پێببەخشن!
ڕاستیان فەرمووە، کورد لە نێوخۆدا، نەتەوەیەکی ناکۆک و ناتەبایە. نەتەوەیەکی زیندووکوژی مردوو پەرستە. با ئۆجەلان بکوژرێ، جا دەبینین، ئەوانەی ئەورۆ دژی دەدوێن، لە نۆکەری تورک زیاتر چیدیکەیان دەسدەکەوێ! با بزانین، دوای کۆچی ئۆجەلان، ئەو جۆرە کوردانە، چ جۆرە پروپاگەندەیەکی دیکەی ژاراویی دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستان بلاودەکەنەوە!
ئەو کوردە بێ هەستانە، بیرێ لەوە ناکەنەوە، باکووری کوردستان، گەورەترین بەشی نیشتمانەکەمان پێکدەهێنێ. نزیکەی دوو لە سەر سێی هەموو کورد، لەوێ دەژین. چەندین شۆڕشی خوێناویان بەرپاکردووە، هەر هەموو شۆڕشەکانیش، لە لایەن تورکەکانەوە، بە ئاگر و ئاسن کوژێندراونەتەوە. لە دوای شۆڕشی دەرسیمەوە، ئەمە یەکەم جارە، بە هۆی شۆڕشی P.K.K.ەوە، گەلی کورد هۆشێکی بە بەرداتێتەوە، بەو شێوەیە هەستی نەتەوەیی دەبوژێتەوە، گەشەدەکا، دژی داگیرکەری وولاتەکەی ڕادەپەڕێ، داوای ئازادیی و سەربەخۆیی دەکا. لەوانەیە، گەر بلێسەی ئەم شۆڕشە نەتەوەیی یەی ئەم جارەش بکوژێندرێتەوە، کورد بە پەنجا سالی دیکەش، جارێکی دیکە نەتوانێ، لە شوێنی خۆی بجوولێ! لەوانەیە، گەر ئەم جارە کورد، لە سەر خاکی نیشتمانەکەی خۆی هەلکەنن، وەک ئاردی نێو درک بلاوەی پێبکەن، هەلی مێژوویی وای بۆ هەلنەکەوێتەوە. چونکە نابێ، ئەوەمان لە بیربچێ، هەلی مێژوویی، بۆ ئەو گەلانەی پشت ئەستوورنین و دۆستی ستراتیژییان نییە، هەروا بە خۆڕایی و زووزوو هەلناکەوێ. (هەر هەلێکی مێژوویی بۆ نەتەوەی کورد ڕێدەکەوێ، گەر لە کات و شوێنی پێویستی خۆیدا، هەولی بۆ نەدرێ و نەقۆزرێتەوە، بۆ نەتەوەیەکی بێچارەی وەک

نەتەوەی کورد، دوورنییە، ئەو هەلە مێژوویی یە، دوای چەند ساڵێکی دوورودرێژی دیکەی چاوەڕوانیی لە قاپیمان بداتەوە. بۆ نموونە: بەدرخان بەگی بۆتان، لە «1846»دا، میرنشینەکەی لە کوردستانی بندەسی عوسمانیدا، لە باکووری کوردستان دامەزراند، تورکەکان میرنشینەکەیان لەنێوبرد، پاش سەد ساڵی خشت، قازی شەهید و هاوەڵەکانی، لە «1946»دا توانییان، کەڵک لە هەلی جەنگی دووەمی جیهانی وەربگرن و کۆماری ئۆتۆنۆمیی، لە بەشێکی ڕۆژهەلاتی کوردستاندا دابمەزرێنن. کە کۆمارەکەش ڕوخا، پاش «46» ساڵ، گەلی کورد لە باشووری کوردستاندا، بە سوودوەرگرتن لە بارودۆخی نێوچەکە و جەنگی دووەمی کەنداو، دوای ئەو هەموو جەنگی قەلاچۆکردن، بەکارهێنانی چەکی کیمیاویی، ئەنفالەکان و لەدەسدانی باشووری کوردستان توانییان، داگیرکەر لە کوردستان بەدەرنێن و لە «1992/05/19»دا، هەڵبژاردنی یەکەم ئەنجوومەنی نیشتمانیی کوردستان بە ئەنجامبگەیەنن و لە «10/04»ی هەمان ساڵیشدا، فیدراڵیزم بۆ باشووری کوردستان ڕابگەیەنن.)«187،4».

لە کۆتاییدا دەڵێم: نیشتمانپەروەری خاوەن باوەڕ، کوردپەروەری دڵسۆز، ناسیۆنالیستی ڕاستەقینە ئەو کەسانەن، هەمیشە لە بەرەی گەلدا، خۆیان دەبیننەوە. لە پێناوی ئامانجە ڕەواکانی گەلدا دەکۆشن. دژی نەخشە و پیلانە گلاوەکانی، دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستان ڕادەوەستن. لە ڕۆژی تەنگانە و لێقەومانی نەتەوەکەیاندا، هەرچییەکیان پێبکرێ، درێغی ناکەن. بە ئاسانیی دۆست و دوژمن لە یەکدی جیادەکەنەوە.

هەموو سەرکردەی ڕێکخراوەکان، هەموو ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستان، هەڵە، تاوان و ناپاکییان هەبووە و هەیە. دەبێ، هەر کێشەیە بە جیا، حسێبی خۆی بۆ بکرێ. نابێ، هەموو کارتەکان پێکەوە تێکەڵاوبکرێن. پێویستە دوو شت لە یەکدی جیابکرێنەوە، ڕقوکینە، کێشەی تاکەکەسیی، پاوەنخوازیی پارتایەتیی و گرفتی ڕابەریی، لەگەڵ کێشەی نەتەوەییدا تێکەڵ نەکەین. پێویستە هەموو ناکۆکیی، دووبەرەکیی و کێشە لاوەکییەکان، بە تەواویی پشکوێیخرێن، تەنیا بایەخ بە کێشە سەرەکییە نەتەوەیی یەکەی کورد بدرێ. بۆیە، هەرچەندە ئۆجەلان هەڵەی

زۆربێ، تاوانی بەرانبەر نەتەوەکەی خۆی کردبێ، ئەورۆ وەک سەرکردەی ڕێکخراوێکی مەزن و شۆڕشگێڕ، ژیانی لە مەترسی دایە، لە سەر هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر پێویستە، پشگیری ئۆجەلان بکا، وەک کوردێکی نیشتمانپەروەر و شۆڕشگێڕ بیناسێنێ. دژی داواکارییەکانی تورک ڕاوەستێ، پڕوپاگەندەکانی دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستان پوچکاتەوە. هەرچی شتێ پێویستە، بۆ ئەوەی ژیانی ئەو کوردە خەباتگێڕە، لە مردن ڕزگاربکرێ، پێویستە بێ یەک و دوو بە زوویی بکرێ.

ستۆکهۆلم
1998/11/15

تێبینی :
هێندێ لەم بۆچوونانە، لە ڕادیۆی کوردیی شاری ستۆکهۆلم، لە بەرنامەکانی « هەنگاو » ڕۆژی(1998/11/15) و « دەنگی گەلی کوردستان » ڕۆژی(1998/11/20)، لە وتووێژێکی تێلێفۆنیدا باسکراوە.

# با جارێ پەلە نەکەین
# هێشتا زووە فتوای وا بدەین!

لە گۆڤاری « ڕەنگین »ی ژمارە « 103 »ی ساڵی « 1997 »دا، مامۆستای مێژوونووسمان دوکتۆر کەمال مەزهەر، گوتارێکی کورتی لە ژێر ناونیشانی « ویژدان و مێژوو ... یان دادگەی موشیری حەمەی سلێمان »دا نووسیوە. مانگنامەی « پەیام »یش لە لەندەن، دووبارە بلاویکردۆتەوە. گەر « پەیام » ئەو گوتارەی بلاونەکردایەتەوە، لەوانەیە، زۆر درەنگتر بماندیایە. چونکە هەموو بلاوکراوە کوردییەکانی کوردستان و عێراق، هەروا بە ئاسانیی لە هەندەران، دەس هەموو کەس ناکەون. لەبەرئەوە، ئەم دەمەتەقێیە لەسەر ئەو بابەتە کەمێ دواکەوت.
ئەوەتەی دوو گوێمان لێ ڕاوە، ئەوەتەی ڕاست و چەپی خۆمان دەناسین، ئەوەتەی ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی کورد، یەک لە دوای یەک بلاوەیانپێکراوە، باووباپیر و مێژوونووسانمان، دەمبەدەم و پشتبەپشت بۆمان دەگێڕنەوە، کە (ئیدریسی بدلیسی، مەلای خەتێ و موشیری حەمەی سلێمان) و کێ و کێی دیکە، ناپاکییان لە کورد کردووە. بەلام ئەوەتا ئەوڕۆ، دوکتۆر کەمال ڕاماندەچلەکێنێ و دەیەوێ، بۆمان ساغکاتەوە، گوایە ئەو پیاوانە ناپاک نەبوون و غەدریانلێکراوە، بۆیە سەرەتای نووسینەکەی بەم شێوەیە دەڕازێنێتەوە و دەڵێ: (بە داخەوە جاری وا هەیە درۆیەکی هەلبەستراوی فیتنەبازێکی ناحەز بە زۆری زۆردارەکی دەکرێتە ڕاستییەکی مێژوویی،

هەموران لە ئاسمانەوە دەیقۆزنەوە. هی وایان هەیە مشتێکیشی دەخەنە سەر و وەک شایەر هەر دەیلێن و دەیلێنەوە، نان و پیازی پێوە دەخۆن. ئێمە بۆ بیرکردنەوەی قووڵ، بە درێژایی دەیان ساڵ تاوانی نیشتمانفرۆشیمان داوەتە پاڵ زانایەکی دووربینی وەک مەولانا ئیدریسی بدلیسی، یان مەلای خەتێ و کەسانی تر.
موشیری حەمەی سلێمانی هەمەوەندیش، یەکێکە لەوانەی مێژوونووسی کورد لەخۆڕا، بە تۆمەتێکی هەڵبەستراو ناوی زڕاندووە.)«5،10» دیارە هەر یەکێ لەو پیاوانەی دوکتۆر ناویهێناون، چیرۆک و بەسەرهاتی تایبەتیی خۆیان هەیە. بەڵام با جارێ، واز لە هەر دوو زانای بە ناوبانگی موسوڵمان، (بدلیسی و خەتێ) بهێنین، تا لە دەرفەتێکی دیکەدا، هەڵمان بۆ دەڕەخسێ و بەسەریاندەکەینەوە. هێندەی بابەتەکەی دوکتۆر، سەرنجڕاکێشە و ئەوە دەهێنێ، خۆمانی پێوە ماندووکەین، سەرەتا سەردانێکی ئەرشیفی مێژوو دەکەین، تا بزانین موشیر ئاغای هەمەوەند، چۆن کوردێ بووە، وا دوکتۆر داکۆکیی لێ دەکا؟!
پێشەکی دەمەوێ، بڵێم: وا بزانم، هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر و دڵسۆز، لە کانگای دڵەوە حەزیدەکرد، لە سەرانسەری مێژووی نەتەوایەتیماندا، لە نێو ڕیزەکانی کورددا، یەک تاکە کوردی خۆفرۆش و نیشتمانفرۆشی تێدانەبوایە. بەڵام کە باخە پانوبەرینە ڕازاوە مێژوویی یەکەی کورد، وەک باخی زۆربەی نەتەوەکانی دیکە، بێ درک نابێ، ئەوەیان لە دەسەڵاتی ئێمەدا نییە. وا دیارە « حوکمی قەدەر وای کردووە ! » ، دەبێ، چەمی مێژووی کوردیش، برێ چەقەڵی تێدابێ! کەواتا گەر لە مێژووی نەتەوەکەماندا، چەند ناپاکێکمان تێداهەڵکەوتبێ، دەبێ ناویانبهێنین، لە خراپەکاریی، خۆفرۆشیی و ناپاکیدا، بە نموونە بیانهێنینەوە، بەڵام پێویست ناکا، بە خۆڕایی غەدر لە کەس بکەین، مێژووی نەتەوەکەمان بشێوێنین، بەڵکوو دەبێ، ئەو مێژووە، لەسەر بنچینەیەکی زانستانە شیبکەینەوە، بە بەڵگەی ڕاستەقینەی مێژوویی بیسەلمێنین، لە کەفوکوڵی دەروون، هەست و سۆزی نەتەوەیی دوورکەوینەوە، مێژووەکەمان بە باشی شەن و کەوکەین و لێکۆڵینەوەی لە سەر بکەین.

دیاره، مێژوونووسەکانی ئەو سەردەمانە، هەر لە خۆڕا شەقوهڕ، تاریکەشەوی کۆمەڵگەی کوردەوارییان، بەر تەقەی تفەنگ نەداوە. چەند جارێ جەنگ، لە نێوان سوپای ئینگلیز و شۆڕشگێڕانی کورددا قەوماوە، ئەوانیش چاکی چالاکییان بە لاداکردووە و بەسەرهاتەکانیان بۆ تۆمارکردووین. ڕووداوەکانی ئەو جەنگانەیان چۆن دیوە، بە تایبەتیی جەنگی دەربەندی بازیان، هەر بەو شێوەیەش نووسیوویانە. بۆیە ئەوڕۆ، لەو سەرچاوانە زیاتر، هیچی دیکەمان لە بەر دەسدانییە. جا لە ڕاستیدا، سەرەتای ڕووداوەکە و کۆکردنەوەی هێزەکان، چۆن بووە و چۆن نەبووە، ئێمە ئێستا هیچی لێنازانین، بەڵکوو هەر هێندەی لێدەزانین، کە مێژوونووسەکانمان بۆمان دەگێڕنەوە. وەک دوکتۆر کەمالیش، لە مێژوونووسەکانی ئەو سەردەمەی کورد و لە دەکۆمێنتەکانی ئەرشیفی بریتانیای وەرگرتووە، دەڵێ: (ڕۆژی حەڤدەی حوزەیرانی ساڵی (1919) هێزەکەی جەنراڵ فرێزەر لە کەرکووکەوە کەوتە ڕێ و لای ئێوارێ گەیشتە نزیک دەربەندی بازیان. دوای ئەوەی تاریکایی داهات، بەپێی نەخشە و پلانێکی سەربازیی ورد بەشێکی زۆری ئەو هێزە، بێ ئەوەی ئەو دیو هەست بەم دیو بکات، بە شاخ و گرد و تەپۆڵکەکاندا هەڵگەڕان. تۆپە دوورهاوێژەکانیشیان سەنگەری لەباریان لێدا. بەرەبەیانی ڕۆژی داهاتوو ئەو هێزە گەورەیە لە ناکاودا کەوتە هێرش و لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا هەموو شت بڕایەوە.) «5،10» بەڵام لێرەدا، مشتومڕەکەی ئێمە لەسەر ئەوە نییە، جەنگەکە چۆن ڕوویداوە، بەڵکوو لەسەر ئەوەیە، ئایا ئەو هێزە گەورەیە، تەنیا بە شارەزایی خۆیان، بە هەر دووبەری ڕیزەچیاکانی دەربەندی بازیاندا هەڵگەڕان، یا پێشەکی نەخشە و پلانیان بۆ دانرابوو، چاوساغێکی وەک موشیر ئاغایان لەگەڵدا بووە، تا ڕێگایان پیشاندا؟

پێش ئەوەی، پەل بۆ نێو قووڵایی ئەو باسە بکوتین، دەمەوێ چەند شتێکی بەڵگەنەویست باسبکەم. هێزەکەی ئینگلیز موشیر ئاغا یا هەر خۆفرۆشێکی دیکەیان لەگەڵ بووایە، یا کەسیان لەگەڵ نەبووایە و هەر خۆشیان بە تەنیا بوونایە، گومانم لەوە نییە، هێزی شۆڕشگێڕەکانیان تێکدەشکان. چونکە ئەز پێموانییە، هێزەکەیان تەنیا لەبەرئەوە شکاوە، موشیر ئاغایان لەگەڵ بووە، ڕێگای پیشانداون و ناپاکیی لە کورد کردووە، وەک هێندێ لە

میژوونووسان باسیدەکەن، دوکتۆریش بە تەوسەوە ئاماژەی بۆ دەکا و دەڵێ: (دوای ئەو تێکشکانە گەورەیە بەندوباوی ئەوە بڵاوبۆوە گوایە موشیری حەمەی سلێمان، کە یەکێک بوو لە ناسراوانی هەمەوەند، لە پشتەوە ڕێگەی نیشانی ئینگلیز داوە بۆیە هێزەکەی جەنراڵ فریزەر توانیویە زەفەر بە کورد بەرێ. ئەوانەی پێیان وایە کورد هەرگیز ناشکێ، تایبەت لایەنگرانی شێخ مەحموود، ئەم بەندوباوەیان لە ئاسمانەوە قۆستەوە، چونکە بیانوویەکی باش بوو بۆ لێکدانەوەی تێکشکاندنی کورد. دوایی مێژوونووسانی کوردیش سووک و ئاسان کردیانە ڕاستییەکی نەلەقاو لە ناو تۆماری مێژوونووسیی کوردیدا.) «5،10»، دوکتۆر بۆ ئەوەی دید و بۆچوونە نوێکانی خۆیان بۆ بسەلمێنێ، سێ خاڵی سەرەکیی پێش چاوخستووین. ئێمەش کەمێ دواتر، بەپێی توانا هەوڵدەدەین، بە کورتیی لێیان بدوێین.

هەرچەندە لە هێندێ کاتدا، ناپاکیی و تێکشکان، پێوەندییەکی توندوتۆڵیان لە نێواناندا هەیە. گەر کەسێ، کۆمەڵێ، خێڵێ یا ڕێکخراوێکی ڕامیاریی، ناپاکیی لە گەلەکەی خۆی نەکا، هێزی دوژمن بۆ سەر سەنگەری شۆڕشگێران بانگنەکا، پێش سوپای داگیرکەر نەکەوێ، دوورنییە، سەرئەنجامی جەنگەکە بە شێوەیەکی دیکە بشکێتەوە. بەڵام ناپاکییەکەی موشیر ئاغا، هەموو شتێ نییە، هێزەکەی شێخ تەنیا لەبەرئەوە نەشکاوە، چونکە موشیر ئاغا پێش سوپای ئینگلیز کەوتووە، بەڵکوو ئەوە تەنیا، بە یەکێ لە هۆکانی ئەو گەمارۆدان، پەلاماردان، شەڕی دەسەویەخە و تێکشکانە دادەنرێ، ئەگینا گەر واشنەبووایە، ئەوان هەر دەشکان.

بەڵام تێکشکانی هێزەکە، نە تەنیا بۆ ناپاکییەکەی موشیر ئاغا دەگەڕێتەوە، نە دەشتوانین، پاساوی ناپاکییەکەی ئەویشی پێبدەین. چونکە هەر دوو ڕووداوەکە، ناپاکیی و تێکشکان، شانبەشانی یەکدی ڕۆیشتوون و لە یەک کاتدا ڕوویانداوە. واتا هێزەکەی کورد شکاوە و موشیر ئاغاش ناپاکیی خۆی کردووە. بەڵام ناپاکییەکەی ئەو، تەنیا هۆی ئەو تێکشکانە گەورەیە نەبووە، بەڵکوو کۆمەڵێ هۆی دیکە هەبوون، هەموو پێکەوە بڕیاری ئەو تێکشکانەیان داوە. ئەمە ڕاستییەکی بێ چەندوچوونە و دەمەتەقێ هەڵناگرێ. بۆیە ئەز پێموایە، گەر موشیریش لەگەڵ هێزەکەی شێخ بووایە،

لەو جەنگەدا هەر تێکدەشکان، بەلاّم ئەوەی گومانی تێدانییە، ئەوەیە، ئەنجامی پێکدادانەکە بەو شێوە تراژیدییە نەدەشکایەوە، شۆڕشگێڕەکان تووشی شەڕی دەسەویەخە نەدەبوون، ئەو هەموو خەلکە برینداردەبوون، ئەو هەموو شەهیدەیان نەدەدا. لەوانەیە، گەر بیانزانیایە، بەرگەناگرن، هەر زوو پاشەکشەیان بکردایە، یا شێخ مەحموود بە برینداریی نەگیرایە.
هەلبەتە وەک دوکتۆریش باسیدەکا، ئەو لێکدانەوەیەی دەلێ: (گەر خیانەتی موشیری حەمەی سلێمان نەبووایە هەرگیزاوهەرگیز ئینگلیز نەیدەتوانی بەسەر کورددا زالّ ببن.)«5،10» زۆر ساکارە، زیاتر لەوە دەچێ، لە کەفوکولێکی هەلچووی هەست و سۆزی نەتەوەیی یەوە هەلقولاّبێ. گوایە کورد هێندە ئازایە، نابێ، لە هیچ سەردەمێکدا، لە هیچ جەنگێکدا، بە هیچ جۆرێ تێکبشکێ.
گەر روونابیر و مێژوونووسەکانمان، بەو شێوەیە لە کوردیان روانیبێ، گەر رووداوەکانیان بەو شێوەیە شیکردبێتەوە، گەر ئەنجامی تێکشکاندنەکانیان بەو جۆرە لێکدابێتەوە، ئەوە تەنیا نیشانەی ئەوەیە، ئەوان لە بارودۆخی قۆناغە جیاوازەکانی مێژوو تێنەگەیشتوون، هەلومەرجی نێوخۆیی و دەرەکیی کوردستانیان رەچاونەکردووە، بەلکوو هەموو تونی ئاسا، بۆچوونی نووسەرەکانی پێش خۆیان دووبارەکردۆتەوە. ئەگینا یا کورد، بە نەتەوەیەکی ئازا ناویدەرکردبێ، یا بە دەیان لەشکری وەک یۆنانییەکانیشی راونابێ، بەلاّم مەرج نییە، لە هەموو پەلاماردان و پێکدادانەکانیدا، تاهەتایە هەر سەرکەوتووبووبێ، یا کاتێ لە جەنگێکی دیاریکراودا شکێندرابێ، هۆکەی بۆ چەند خالّێکی لاواز بگێڕێتەوە. بەلکوو کوردیش، وەک هەموو نەتەوەکانی دیکەی سەر رووی ئەم زەوییە، چەندیش ئازابێ، لە سەرانسەری مێژووی خۆیدا، لە جەنگەکانیدا دژی دوژمنان و داگیرکەران، بە شێوەیەکی زۆر خراپ شکێنراوە. بە پێچەوانەشەوە، هێندێ جاریش، گەلێ سەرکەوتنی مەزنی بەدەسهێناوە. بۆ نموونە:
هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان، لە شۆڕشی(1961/09/11)دا، لە گەلێ لەو نەبەردانەی، دژی سوپای داگیرکەری عێراق بە ئەنجامیاندەگەیاند، سەرکەوتنی زۆر قارەمانانەیان بەدیدەهێنا، وەک لە جەنگە بە ناوبانگەکەی

« هەندرێن »ی(1966/05/12)دا ڕوویدا، کــــە نموونەی جــــەنگی پارتیـزانیی، لەخۆبوردوویی، ئازایی و دڵسـۆزیی پێشـمـەرگـەکـانی ئەو سەردەمە بوو. کەچی هەر ئەو پێشمەرگانەی هەمان شۆڕش بوون، لە بەهاری (1974)دا، لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستـان تێکشـکان، هەمـوو(دەشتی هەولێر، شـارۆچکەی ڕانیە، پشـدەر، ڕەواندز، نێوچەی بادینان، قەرەداغ و ناوچەی شـارەزووری)یان، بۆ دوژمن چۆڵکرد و بەرگرییـان پێنەکرا. دیارە، ئەوە بە کـارێکی سروشـتیی جەنگ لە قـەڵەمدەدرێ، چونکە پێوەندییـەکی توندی بە بارودۆخی سـەردەمەکە، تەرازووی هێزەکان، ژمارەی جەنگاوەرانی هەر دوولا، هێز و تواناى جەنگاوەرەکان، کەرەسەی جەنگیی مۆدرێن، جۆری چەک، بەرژەوەندیی هێزەکانی نێوچەکە و دەورووبەرەوە هەیە. هەروەها نابێ، باری جـوگـرافـیـا، شـێـوەی تۆپۆگـرافـیـای زەوی و هەڵکەوتی گـۆڕەپانی جەنگەکەمـان لە بیربچێ، چونکە جوگرافیا و تۆپۆگرافیای ناوچەکە، وەک فـاکـتـەرێکی گـرنگ، کـاریگەرێتی تایـبـەتیی خـۆیان هەیە، هێندێ جـار چارەنووسی جـەنگەکـە دیاریدەکـەن. ئەوە جگە لەوەی، خـواردن و ئاویش، کـارێکی یەکـجـار گـرنـگ لە مـانەوە، خـۆڕاگـرتن، بەردەوامـبـوون و پلەی بەرەنگاربوونەوەی جـەنگاوەرەکـان دەکـا، وەک ناپلیـۆنیش دەڵێ:(لەشکر لەسەر گەدەی دەڕوا).
جـا با ئێســتـا پێکەوە، بازێ بەســەر ئەم باسـانەدا بدەین، سـەرێ بە لای بەڵگەکانی دوکتۆر کەمالدا شۆڕبکەینەوە، تا بزانین، چۆن بۆمان دەسەلمێنێ، مـێـژوونووسـان غـەدریان لە مـوشـیـر ئاغـا کـردووە و بە نیـشـتـمـانفـرۆش ناویانزڕاندووە، دوکتۆریش لەبەرچی، داوای لێبوردن لە گیانی پاکیی دەکا و بە نیشتمانپەروەر ناویدەبا!
ئاشکرایە، لەو ڕۆژەوە لەشکرەکەی شێخ مەحموود، لەگەڵ سوپای ئینگلیز، لە نێـو دەروازەکـەی دەربەندی بازیان، دەسـەویەخـە تێکـئالان، لە ئەنجـامـدا هێزی کورد تێکشـکا و سـوپای ئینگلیز سـەرکەوت، ڕووناکـبـیر، نووسـەر و رامـیـارەکـانی کـورد، لە ئاخافتن و نووسـینەکـانی خۆیاندا،(مـوشـیـر ئاغـای حەمەی سلێمانی هەمەوەند)، بە ناپاک لە قەڵەمدەدەن. ئەم تاوانبارکردنەش هەروا بەخــۆڕایی نەهاتووە، بەڵکوو لە ئەنجـامـی کـردەوەکـانیـدا بووە.

تاوانەکـەش خـۆی لەوەدا دەبینێ، ئەو پیـاوە، سـوپای داگـیـرکـەری ئیمپریالیزمی بریتانیای، لە پشتەوە و بە قاچاغەڕێدا، بۆ سەر لەشکرەکەی شێخ هێناوە.
بەپێی لاپەڕەکـانی « چیم دی »، جـەنگەکـە لە(22/یونی/1919)دا ڕوویداوە. کەچی دوای ئەوەی نزیکەی هەشتا ساڵ، بە سەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕدەبێ، ئێستاش دەسی ناپاکیی بۆ ئەو پیاوە ڕادەکێشرێ.
بەڵام ئەوا ئەوڕۆ، یەکەم کەس و یەکەم ڕووناکبیری کورد « دوکتۆر کەمال مـەزهەر »، پێ بە جـەرگی خـۆیدا دەنێ، دەیەوێ، پلەوپایەی نیشتمانپەروەریی و کۆمەڵایەتیی، بۆ موشیر ئاغا بگێڕێتەوە، دوای ئەوەی ئەو پیاوەی لە مێژووی کـورددا، چەند جارێ وەک ناپاکێ ناساندووە و دەڵێ: (من بۆ خۆم سێ جاران لە نووسینی بڵاوکراوەی خۆمدا ئەو قسەڵۆکە هەڵبەستراوەم تۆمارکردووە، داخەکەم هەر سێ جارەکەش بە زمانی ڕووسی بوون)«5،10» ئێستاش دەیەوێ، ئەو غەدرەی لە گیانی ئاغای هەمەوەند کراوە، بە زیادەوە تۆڵەی بۆ بکاتەوە. بۆیە لە کۆتایی گوتارەکەیدا، داوای لێبووردن لە گیانی پاکی دەکا، بڕوانامەی پاکیی و نیشتمانپەروەریی بۆ مۆردەکا و دەڵێ: (من بەش بە حاڵی خۆم، زۆر بە گەرمی، داوای لێبووردن لە موشیری حەمەی سلێمان و هۆزی سەربەرزی هەمەوەند و شۆڕەسوارانی دەکەم.)«5،10»
ئەم دید و بۆچوونە نوێیەی دوکتۆر کەمال، ئەوەمان بیر دەخاتەوە، کە مێژوو لە گەلێ شوێنی ئەم جیهانە و لە هێندێ بواردا،، چەندین جار خۆی دووبارە و چەند بارەدەکاتەوە. ئەوەتا، دوای پتر لە هەشتا ساڵی ڕەبەق، ئێسکەکانی بنەماڵەی ڕۆمانۆڤی دوا تزاری ڕووسیا، لە گۆڕ دەردەهێنن و زۆر بە ڕێزەوە، لە تەنیـشت باووباپیـرانی خـۆیانەوە دەیاننێـژن. هەروەها لە سـەردەمی خرۆشێڤدا، لە یەکێتی سۆڤیەت، پەیکەرەکەی ستالینیان لابرد و مافی ئەندامێتیشیان لێ سەندەوە، کەچی پاشان لە سەردەمی برێژنێڤدا، پلەوپایە و ڕێزی تایبەتیی خۆیان بۆ گێڕایەوە. لە عێراقیشدا، هەمووی چەند ساڵێ لەمەوبەر بوو، زۆر بە چاکە باسی ڕۆڵی بنەماڵەی شا فەیسەڵیان دەکرد و مەزراکانیان بۆ هەڵبەستنەوە. گەر ئەوڕۆ لە کوردستانی بندەسی ئێمەشدا،

شتێ لەو ڕووداوە مێژوویی یانە ئێقبداتەوە، شتێکی سەیر نییە!
بەڵام با جارێ، لێرەدا هەڵوێستەیە بکەین، پەلەنەکەین، بەخۆڕایی سەری قایلبوون بۆ دوکتۆر نەلەقێنین. هەر لەبەرئەوەی، مێژوونووسێکی شارەزا، بە توانا و ناسراوی وەک دوکتۆر، سەرەداوی گرێکوێرەی کلافەی گرفتێکی مێژوویی، لەو چەشنەی بۆ کردوینەتەوە، ئیدی هەر لە خۆمانەوە و بێ بەڵگە، لە پشتی ملی بۆ بدەین و پشگیریبکەین.
هەرچەندە، بەم هەواڵە نوێیەی دوکتۆر، هێندێ لە ڕووناکبیر و نووسەران، تووشی دڵەڕاوکە، دڕدۆنگیی و ڕاڕایی دەبن، بە چاوی گومانەوە لە مێژووی نەتەوەکەمان دەڕوانن، وایانلێدێ، بیربکەنەوە، پتر بە دوای ڕاستییەکاندا بگەڕێن. لەگەڵ ئەوەشدا، دوکتۆر هەوڵیداوە، تاڵەمووی باریکی ملی خۆی، لە دەس چەقۆی تیژی مێژووی تاوانباریی ڕزگاربکا. بەڵام هێشتا زووە و زۆری ماوە، ئەو ڕاستییەی دوکتۆر دەیەوێ، بڕوامان پێبهێنێ، بە تەواویی لە نێو بیر و هۆشی خوێندەوار و نووسەران بە تایبەتیی و کۆمەڵانی خەڵک بە گشتیی، جێگەی بکاتەوە و وەک ڕاستییەکی بێ چەندوچوون بیچەسپێنێ. چونکە :
1. تا ئێستا، هەموو سەرچاوە مێژوویی یەکانی وەک (یاداشتەکانی ڕەفیق حیلمی، چیم دی ئەحمەد خواجە ... تاد)، کە نووسەرەکانیان لەو ڕۆژگارانەدا، لە نێو جەرگەی کارەساتەکاندا ژیاون، ئەو ناپاکییەی موشیر ئاغایان لە نووسینەکانی خۆیاندا تۆمارکردووە، تا دوارۆژەکانی ژیانیشیان، لێی پەشیمان نەبوونەتەوە و هیچ کەسێکیشیان پاکانەیان بۆ نەکردووە. با بزانین، ئەو دوو نووسەرە، لەو بارەیەوە چیمان بۆ دەگێڕنەوە؟
مامۆستا ڕەفیق حیلمی، لە یاداشتەکانیدا دەڵێ: (لەم دەربەندەوە کە بە لەشکری شێخ مەحموود تەنرابووەوە و گیرابوو، تێپەڕین بۆ لەشکرەکەی ئینگلیز شتێکی ئاسان نەبوو. « شێخ مەحموود »یش ئەوەی بە بیرا نەئەهات، کە لە لایەکی ترەوە بتوانن، لە دەربەندەوە تێپەڕن و هەڵمەتیان بەرنەسەر. چونکە لە زەمانی ئاسوورییەکانەوە تا ئەو ڕۆژە، هەر لەشکرێکی دوژمن ڕووی کردبێتە ئەم وڵاتە، تا لە شەڕی ئەم دەربەندە سەرنەکەوتبێ، نەیتوانیوە پێ بنێتە ئەو دیوی شاخەکەوە. بەڵام بە « ڕابەر »ی « موشیری

حەمەی سلێمان »، یەکێک لە ڕەئیسە بەگزادەکانی « هەمەوەند »، کە ساردی و ناکۆکیی لەگەڵ « شێخ مەحموود » هەبوو، بەشێک لە لەشکرەکەی ئینگلیز، بەیانییەک پێش هەتاوکەوتن و لە ڕێگەیەکەوە بە بیری کەسا نەهاتبێ، لە لای ڕاستی دەربەندەوە بە شاخەکانا سەرکەوت. لە سفیدەی بەیانا و لە کاتێکا کە شێخ مەحموود لە بەردەمی دەربەندەوە بە تەمابوو، هەڵمەت بەرنەسەری، لە پشتەوە دەورەیان دا.)«124،7-125».

لێرەدا مامۆستا حیلمی، تەنیا باسی ناپاکییەکەی موشیرئاغا و دەربەندی بازیان دەکا. هەروەها دوکتۆریش هەر باسی ئەو ڕووداو و شوێنە دەکا. بەڵام « ئەحمەد خواجە »، جگە لە جەنگەکەی دەربەندی بازیان، لە چەند جێگایەکی دیکەی بیرەوەرییەکانیدا، ناوی موشیری هەمەوەند دەهێنێ، باسی پەلاماردان و هێرشەکەی « تاسلوجە »ش دەکا، بە چ شێوەیە، ڕۆڵی ناپاکانەی خۆی تێدا بینیوە.

دوای ئەوەی، ئەحمەد خواجە، تابلۆیەکی ڕەنگاوڕەنگی، چۆنێتی شەڕەکە و ئازایەتی بێچووە شێرانی کوردمان بۆ دەکێشێ، پاشان باسی موشیر ئاغا دەکا و دەڵێ:(تا پاش نیوەڕۆ، تاسلوجە بوو بە گۆڕستانی ئەو سوپایە و گیاندار لە دوژمن بڕا. وا ئەزانم، زابتێک لەگەل مشیری حەمەی سلێمانی هەمەوەندا ڕزگاری بوو.)«41،1» ئەمە ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ، موشیر ئاغا لە شەڕی تاسلوجەدا بەشداریی کردبێ، کە چەند ڕۆژێ پێش شەڕی دەربەندی بازیان ڕوویدابوو. پاشان لە جێگایەکی دیکەدا دەڵێ:(لەو کاتەدا، کە لە لای حاجی سەیید عومەر بووم، پیاوێکی شاڵ سەوز بەسەریان هێنا. لە ناو پێلاوەکانیا نامەیەک دۆزرابۆوە، دایە دەستم، فەرمووی چی نووسراوە؟ ئەمە بوو: لە ع. بۆ م. ئەژەون خ ناچێت. پێی وت: نێرە مراوی لە وشکی مەلە ئەکەیت، ئەمە چییە؟ وتی سێ زابت دایانمێ، کە بیبەم بۆ مشیر ئاغا. وتیان بلێ خواردن ناچێت.)«45،1» ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخا، موشیر ئاغا نەک هەر لە شەڕەکاندا بەشدارییکردووە، بەڵکوو تۆڕی سیخوڕیشی ڕێکخستووە.

دەربارەی جەنگەکەی دەربەندی بازیانیش دەڵێ:(لە ژێر جڵەوکێشیی مشیر ئاغای هەمەوەندا، کە بە فەرمانی حوکمداری کوردستان کرابوو بە سەرۆکی

هێزی چەمچەماڵ، لە لاڕێی چیای دەربەندەوە، لە چەپ و ڕاست و ڕووبەڕوو، بە هێزێکی سوارەی گیان بەلاشی هیندییەوە، بە سێ لێشاوی بەدبەختی و خوێنمژ، لە ناکاو و سپیدەی عاسماندا هێرشیان هێنا.)«1،47-48» پاشان دەڵێ: (لەسەر پیشاندان و پەیامی مشیر ئاغا، بە بریندار یی شێخ مەحموود لەگەڵ شێخ حەمە غەریب بە یەخسیر گیران و بران بۆ بەغداد و دوایی جەنگیش هات.)«1،48»
هەڵبەتە شێخ مەحموود خۆی، لەو کاتەدا موشیر ئاغای دیوە، بۆیە ئەم قسەیە باسدەکرێ، ئەگینا چۆن موشیر، شێخی پیشانی ئینگلیزەکان داوە؟!!
وا بزانم، ئەم چەند کۆپلەیەی لەو دوو سەرچاوەیەوە وەرمانگرت، گەواهی ئەوە دەدەن، موشیر ئاغا لەو سەردەمەدا، پێوەندیی بە ئینگلیزەکانەوە هەبووە و دژی لەشکرەکەی شێخ مەحموود لە کاردابووە. ئەو دوو پیاوەش، خوێندەوار و ڕووناکبیری سەردەمی خۆیان بوون، لەو باوەڕەدانیم، شتێکی تایبەتیشیان لەگەڵ موشیر ئاغادا هەبووبێ، تا ئەو بوختانانەی بۆ هەڵبەستێ!
2 . ڕاستە وەک دەماوەم دەگێڕنەوە و دەڵێن: موشیر ئاغا لە پێشدا، لەگەڵ شۆڕشگێڕەکان بووە، پاشان لەگەڵ شێخ مەحمووددا تێکچووە، بۆیە پەنای بۆ بەر ئینگلیزەکان بردووە. بەلام جگە لەوەی، هیچ شتێ پاساوی ناپاکیی نادا، تا ئێستاش، چ بە دەمی و چ بە نووسین، لە مێژووی کورددا نەبیسراوە، دوای ئەو ڕووداوە، کەس بە نیشتمانپەروەر باسیکردبێ.
3. هێشتا خوێندەوار و نووسەرانمان، بە تەواویی هەموو کونوقوژبنی نووسراوەکانی مێژوویان نەپشکنیوە، هەموو بەلگەنامەکانی ئەرشیفی بریتانیا، بە دوای ئەو ڕووداوەدا نەگەڕاون. تەنانەت دوکتۆر خۆشی، زۆر لەو کارە دڵنیانییە، بۆیە داوا لە ڕووناکبیر و نووسەران دەکا، بۆ دڵنیایی تەماشای بەلگەنامەکانی ئەرشیفی بریتانیا بکەن و دەڵێ: (ئەم باسەی موشیری حەمەی سلێمان پێویستی بە پێداچوونەوەیەکی قووڵە.)«5،10»
هەروەها دەڵێ: (خۆزگە ئەو کوردانەی لە هەندەرانن، بە وردی لە ناو فایلەکانی وەزارەتی مستەعمەرات و فرۆکەوانیی بریتانیادا بە دوی ئەم باسەدا دەگەڕان، چونکە من هەموویانم لەبەر دەستدا نییە.)«5،10»

کەواتە پێویستە بزانین، ئەو ئەرشیفە دەوڵەمەندەی بریتانیا، چی دیکەی لەسەر ئەو ڕووداوە بە تایبەتیی و لەسەر کێشەی کورد بە گشتیی، لە نێو هەناوی خۆیدا حەشارداوە، تا ئەو کاتە بە بەڵگە و لێکۆڵینەوە، لە هەموو باری سەرنجەکان بدوێین، ئینجا پێویستە بڕیار بدەین!

4. پاشان دوکتۆر لەسەر باسەکەی دەڕوا و دەڵێ:(لەو سەدان بەڵگەنامەیەی ئەو ڕۆژگارە، کە من دیومن ناوی موشیری حەمەی سلێمان بە خراپی نەهاتووە. بە پێچەوانەوە، لەم چەندانەدا لە بەڵگەنامەیەکدا، وەک کوردپەروەرێک ناوی هاتووە. یەکێکە لەوانەی سەرەتای سییەکان داوای مافە ڕەواکانی کوردی کردووە.)«5،10»

دەبێ، لێرەدا ئەوە بڵێین: مەرج نییە، کاتێ دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستان، بە چاکە باسی کوردێکیان کرد، بە نیشتمانپەروەر لە قەڵەمیاندا، ئیدی ئەوان ڕاست بکەن و ئێمەش باوەڕیان پێبکەین. چونکە پێویستە، بزانین، بۆچی بەو شێوەیە، بە شانوبازوویدا هەڵدەدەن و بە نیشتمانپەروەری دادەنێن؟ ئایا ئەو سەردەمەی خوارووی کوردستان، لە لایەن ئیمپریالیزمی بریتانیاوە داگیرکرابوو، خەسڵەتی نیشتمانپەروەریی، بە چ سەنگ و تەرازوویەک دەکێشرا؟ نیشتمانپەروەریی لای ئینگلیزەکان چی دەگەیان؟ ڕەنگوبۆی چۆن بوو؟ کێ ئەو مافەی هەبوو، ئەو ناسنامە گرنگە بە خەڵکی ببەخشێ؟ ئینگلیزەکان یا نووسەر و شۆڕشگێڕەکانی کورد بۆیان هەبوو، بڕیار بدەن، نیشتمانفرۆش لە نیشتمانپەروەر، ناپاک لە پاک، ڕەش لە سپی جیابکەنەوە؟ جگە لەوانەش، گەر موشیر، بە ڕاستیی پیاوی ئینگلیز بووبێ و ناپاکیی لە شۆڕشەکەی شێخ مەحموود کردبێ، مەرج نییە، هەموو کاتێ، داگیرکەر فایلی ناپاکیی پیاوەکانی خۆی، بۆ خەڵکی ئاشکرابکا و پەردەیان لە ڕوو هەڵماڵێ، تا ئاوی نێوچەوانیان نەتکێ و خەڵکی دیکەی پێ بەچەترسێن نەبێ.

هەروەها، لە مێژووی کۆن و نوێی کورددا، چەندین نموونەی ناکۆکیی و ناپاکیی، لەو بابەتەی موشیر ئاغامان هەیە. هێندێ کەس لە سەرەتادا، نیشتمانپەروەر و شۆڕشگێڕ بوون، پاشان ناپاکییان لە خاک و نەتەوەکەی خۆیان کردووە. هێندێکی دیکەش، هەر لە بنەڕەتدا خۆفرۆشبوون، بەلام

پاشـان هۆشـیـان بە بەر خـۆیاندا هاتۆتەوە، وازیان لە ڕێگای ناپاکـیی و دوژمنایەتی نەتەوەکەیان هێناوە، بەرانبەر بە داگیرکەری بیانیی ڕاوەستاون و ڕاپەڕیوون. تەنانەت هێندێکیشیان لەو ڕێیەدا، گیانی پاکیان بە دایکی نیشتمـان بەخشیـوە و لە سێدارەدراون، بە خوێنی گەش و ئاڵیـان، پەڵە چڵکنەکانی ناپاکیی ژیانی خۆیان شتۆتەوە، بەو شێـوەیە باجی ناپاکـیی خۆیان داوە. بۆ نموونە « یەزدانشێر » ناپاکیی لە شۆڕشەکەی « میر بەدرخان بەگی بۆتان »کرد، لەگەڵ سوپای تورکدا، پەلاماری شۆڕشگێڕەکانیان دا و ئاگری شۆڕشەکەیان کوژاندەوە. کەچی هەر هەمان « یەزدانشێر »ی ناپاک بوو، دوای ماوەیە، گەورەترین شۆڕشی دژی تورکە عوسمانییەکان بەرپاکرد. بەپێی بۆچوونی، هێندێ لە نووسەر و مێژوونووسان، بڵێسەی شۆڕشەکەی « یەزدانشێر »، لەوەی « میر بەدرخان »، گەلێ بەتینتر و گەشەدارتربووە، لە زۆر ڕووەوە، ڕێکوپێکتر، بەهێزتر و پێشکەوتووتر بووە.

ئەوە جگە لەوەی دەتوانین، لەو بارەیەوە، چەندین نموونەی زیندووی دیکەی نوێ، لە هەمـوو بەشـەکـانی کـوردسـتـانـدا، لەسـەر سـەرانی ئەوڕۆی کـورد بهـێنینەوە. ئەمـە گـەر شـتێ بگەیەنێ، تەنیـا ئەوەیە، مـرۆڤ لە هەمـوو قۆناغەکانی ژیانی خۆیدا لێیدەوەشێتەوە، قاچی بەرەو لێواری چاڵی ڕەشی ناپاکیی هەڵخزێ و ناپاکیی لە خۆی، ڕێکخراوەکەی و نیشتمانەکەی بکا.

لە هەمـان کـاتیـشـدا بۆی هەیە، لە قـۆناغـێکی دیکەی ژیانیـدا، بیـرێ لە خـراپەکاریی و ناپاکـیـیـەکـانی خـۆی بکاتەوە، وەک نیـشـتـمـانپـەروەرێ سەرلەنوێ تێهەڵچێتەوە، لە پێناوی ئازادیی، سەربەخۆیی و سەرفرازیی گەل و نیشتمـانەکەیدا تێبکۆشێ و قوربانیبدا. جا موشیر ئاغاش لەم یاسایە، بەدەرنەبووە و بەدەرنییە. گەر لە سەردەمی شێخ مەحمووددا، دەسی لەگەڵ ئینگلیـزەکـاندا تێکەڵاوکـردبێ، تەنیـا بۆ ئەوەی پشـتی شـێخ لە زەوی بدا، دوورنییە، لە سییەکاندا پەشیمانبووبێتەوە، وەک دوکتۆریش دەڵێ: داوای مـافـە ڕەواکـانی کـوردی کـردبێ! بەڵام جـارێ ئەو گـریمانە، لە لاپەڕەکـانی مێژووی ئەم هەشتا ساڵەی دوایی کورددا، هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێ، تا ئەو ڕووداوە بە تەواویی ڕووننەبێتەوە، تا بەڵگەی نیشتمانپەروەریی ئاغامان دەسنەکەوێ، هەر وەک هەموو ناپاکێکی دیکەی نەتەوەکەمان تەماشادەکرێ.

پاشان دوکتۆر بەڵگەیەکی دیکە دەهێنێتەوە و دەڵێ: (جەنراڵ فرێزەر پێویستی نە بە موشیری حەمەی سلێمان، نە بە هیچ کوردێک بوو تا بە سەر هێزەکەی شێخ مەحموودا سەر بکەوێ. هێزەکەی ئەو بریتی بوو لە دوو لیوای پیادە و سوارەی سیخ و گورگەی شەڕکەری شاخاویی مەشقپێکراوی پڕ لە چەک و تفاقی نوێ و ژمارەیەکی زۆر لە زرێپۆش و تۆپی هەمەچەشنە، کە هاتبوونە جەنگی هێزێکی بچووکی بێمەشقی کەم چەک و تفاقی کۆن، کە تەنیا باوەڕیان بە کەرامات و تەلیسمی گوللەبەندەکەی شێخ مەحموود بە رادەی یەکەم و کوردایەتی بە رادەی چوارەم لە سەنگەری شەرەفدا کۆی کردبوونەوە.)«5، 10»

تاقیکردنەوەی مێژوویی راپەڕین و شۆڕشەکانی کورد، ئەوەمان بۆ دەردەخا، ئەم بەڵگەیە بێ بنچینەیە و لە راستییەوە دوورە. چونکە داگیرکەرانی کوردستان، گەر لەوەش بەهێزتربووبن، گەر سوپاکانیان لەوەش گەورەتر بووبێ، گەر سەربازەکانیان لەوەش زیاتر مەشقیان پێکرابێ، گەر لەوەش زیاتر چەکی جۆربەجۆری مۆدرێنیان هەبووبێ، وەک دوکتۆر باسیدەکا، ئەوا هێشتا هەر پێویستیان بە یارمەتیی و چاوساغیی خۆفرۆشانی نێوخۆ هەبووە. بۆ نموونە: سوپای داگیرکەری دەوڵەتی عێراق، کە وەک ئینگلیزەکان سوپایەکی نامۆ و بیانیی نییە، زۆربەی زۆری سەربازەکانی، لە رۆڵە رەشورووتەکانی گەلانی عێراق پێکهاتووە. دەوڵەتی عێراق، باشووری کوردستان بە بەشێ لە خاکی خۆی و نیشتمانی عەرەب دەزانێ، واتا شارەزاییەکی باشی لە کوردستاندا هەیە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، لەو رۆژەوە ئەو دەوڵەتە عەرەبییە دامەزراوە، هەر کاتێ راپەڕین و شۆڕشێکی چەکدارییی، لە باشووری کوردستاندا بەرپابووبێ، سەرانی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرە، هەمیشە پەنایان بۆ بەر پوازی کوردیی و خۆفرۆشانی نێوخۆ بردووە، تا هێرش بۆ سەر بنکە و سەنگەرەکانی پێشمەرگەی کورد بەرن. چونکە هەمیشە لە هێزی پێشمەرگە ترساون، ویستوویانە، بە کەمترین زیان، شۆڕشەکە جوانەمەرگ بکەن. لەبەرئەوە، هەمیشە پێویستیان بە جاشەکورد هەبووە، تا وەک چاوساغێ پێشیانکەون، رێگایان پیشاندەن، لەگەڵ ئەوەشدا، سەردەمەکەش گەلێ گۆڕاوە، چەکی باشتر و فرۆکەی

جەنگیی مۆدرێنیشیان هەیە، ئەو نەخشانەی(هەموو شار و شارۆچکە و گوند و شاخ و داخ و گرد و تەپۆلکە و دارستان و گۆم و رووبار و جۆگەی کوردستانیان بست بە بست پێوابوو)«5،10»، دوێنێ لای ئینگلیزەکان دەسدەکەوتن، ئەورۆ هەمان نەخشە و بگرە باشتریش، لای داگیرکەری دەوڵەتی عێراقیش چنگدەکەون.
ئەوە جگە لەوەی، هەمووی چەند رۆژێ، پێش ئەوەی ئەو جەنگەی دەربەندی بازیان رووبدا، شۆڕشگێڕەکانی کورد لە تاسلوجە، پەلاماری سوپای داگیرکەری ئینگلیزیان دا. جگە لە کوژراو و بریندار، وەک دوکتۆر خۆشی دەڵێ:(لەو شەڕەدا ئینگلیزەکان شکان. بەپێی سەرچاوەکانی خۆیان چوار زرێپۆش و نۆزدە ئۆتۆمبیلی فۆردیان تێکشکێنران.)«5،10» جا ئیدی خەلکینە هەر خۆتان بڵێن، هێزێکی وا کەم، بە چەند پارچە چەکێکی کۆنەوە، لە بەرزاییەکی وەک تاسلوجەدا، پەلاماری سوپایەکی گەورە و پڕ چەکی مۆدرێنی ئینگلیزیان دابێ،(کە لە تفەنگی پەڕپووتی ماوزەر و بڕنە و چەقۆ و خەنجەر و توورەکەیەک نانەوشکە بەولاوە هیچی تریان پێ نەبووبێ)«5،10»، تەنیا پشت و پەنایان، تەنیا سەرچاوە و قەڵەمی هێزی دەس و ئەژنۆیان، هەر خۆیان بووبن، وەک دوکتۆریش خۆی گەواهییان بۆ دەدا و دەڵێ:(تەنیا باوەڕیان بە کەرامات و تەلیسمی گوللەبەندەکەی شێخ مەحموود بە ڕادەی یەکسەم و کوردایەتی بە ڕادەی چوارەم کۆی کردبێتەوە)«5،10» ئیدی دوای ئەو سەرکەوتنە مەزنەی کورد، دوای ئەو تێکشکاندنە بێتاپووەی ئینگلیزەکان، دوای ئەو هەموو زیانە گەورەیەی، لە شەڕی تاسلوجەدا لە سوپای ئینگلیز کەوت، بۆچی دەبێ، ژەنەڕاڵ فرێزەر لە هێزی کورد نەترسابێ و پەنای بۆ بەر یەکێکی وەک موشیر ئاغا نەبردبێ؟!!
بۆچی دەبێ، پێویستی بە موشیری حەمەی سلێمان یا هیچ کوردێکی دیکە نەبووبێ، تا بە سەر هێزەکەی شێخ مەحموودا سەرکەوێ؟ ئایا دوژمنان و داگیرکەران، بۆ ئەوەی سەرکەون، هەموو هۆیە بەکارناهێنن؟ لە هیچ شتێ سڵدەکەنەوە؟ ئایا مارانگاز لە خشەی مار و مێروو ناترسێ؟!!
هەروەها دوکتۆر لە جێگایەکی دیکەی گوتارەکەیدا، دەربارەی هێزی شۆڕشگێڕەکان دەڵێ:(بە داخەوە، شێخ مەحموود بۆ ئەو کارە گەورەیەی بە

هەزار ناری عەلی و ئەمسەر و ئەوسەر ئەوجا توانیبووی سێ سەد چەکدارێک کۆبکاتەوە.)«5،10»، دیارە، گەر ئەم ژمارەیەی دوکتۆر باسیدەکا، لە بەر ڕۆشنایی ئەو زانیارییانەی لە سەرچاوەکاندا هەن، بەراوردیانبکەین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ، ڕاست نییە. چونکە وەک سەرچاوەکان بۆمان دەگێڕنەوە، هێزەکە گەلێ لەوە زیاتر بووە. شێخ مەحموود هێزەکەی خۆی بە سەر سێ دەستەدا دابەشکردووە. دەستەی یەکەم لەگەڵ شێخ قادری برای لە نزیک چەمچەماڵ، دەستەی دووەم لەگەڵ مەحموود خانی دزلی لە نزیک قەرەهەنجیر و دەستەی سێیەمیش لەگەڵ خۆیدا لە دەربەندی بازیان بوون. هەر بە تەنیا ئەو هێزەی شێخ قادر سەرپەرشتیی کردووە، لەو ژمارەیە پتربووە. لەو بارەیەوە، مامۆستا حیلمی دەڵێ:(« شێخ مەحموود » فەرمانی دا بە « شێخ قادری » برای کە دەسبەجێ بە خۆی و «500» سواری کوردەوە بچێتە« بنە » کە ئەکەوێتە «4» میل ئەو لای باکووری چەمچەماڵ.)«121،7»
بۆیە تا ئەو ڕۆژەی، هەموو ڕاستییەکان بۆ جەماوەری گەل، بە تەواویی ڕووندەبنەوە، بەڵگە مێژوویی یەکان دەیسەلمێنن، ئەو دید و بۆچوونانەی دوکتۆر کەمال، هەروا لە خانەی گوماندا دەمێننەوە. لەبەرئەوە، با زۆر زوو بڕیارنەدەین، پەلەنەکەین، چونکە گەر پەلە لە تاوانبارکردنی موشیردا کرابێ، ئەوا پێویستناکا، پەلە لە سڕینەوەی ئەو تاوانەدا بکرێ، تا جارێکی دیکەش بە هەڵەدا نەچینەوە، سەرلەنوێ تاوانباری بکەینەوە و دیسانەوە لە بۆچوونەکانمان پەشیمانبینەوە. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، دوکتۆر کەمال کارێکی گەلێ چاکی کردووە، چونکە لە دەرگای باسێکی مێژوویی وا گرنگی داوە، ئەو دەرگایەشی لە بەردەمی ڕووناکبیر و نووسەرانی کورددا، لە سەر گازی پشت بە ئاواڵەیی بەجێیهێشتووە.
هەڵبەتە کارێکی زۆر پێویست و ڕەوایە، گەر هەموو کاتێ، بە چاوی گومانەوە لە هەموو شتێ بڕوانین، بە دوای ڕاستیدا بگەڕێین، هەوڵبدەین، هەڵەکانمان ڕاسکەینەوە، پەڵەی تاوانە ڕەش و چڵکنە مێژوویی یەکان، بە بەڵگەی ئەکادیمییانە بشۆرینەوە، دەسی ناپاکەکانی مێژوو، بۆ ڕۆڵەکانی گەل ئاشکراکەین، ناویانبزڕێنین و لە قاویانبدەین. لە هەمان کاتیشدا، ئەو

کوردانەی بە خۆڕایی، سوکایەتییانپێکراوە، تاوانی ناپاکییان وەپاڵخراوە و ناویان لەکەدارکراوە، زۆر بە دڵپاکیی و لەخۆبووردنەوە، داوای لێبووردن لە گیانی پاکی خۆیان و نەوەکانیان بکەین و بە چاوی ڕێزەوە تەماشایانبکەین. وەک دەڵێن، مێژوو لە قۆناغە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا، هەر خاوەن دەسەڵاتە بەهێز و تواناکان نووسیویانەتەوە و دەشینووسنەوە. بەڵام مەرجنییە، ئەو مێژووە مێژوویەکی ڕاستودروست بێ، ئاوێنەیەکی بێگەرد و بالانمای ڕووداوەکانی، سەردەمە جیاوازەکانی ئەو کۆمەڵگەیەبێ. بۆیە دەبێ، ڕووناکبیر و نووسەرانی کوردیش، پەندێ لەم ڕووداوانەی سەردەم وەربگرن، بە چاوی ویژدان و ڕاستییەوە لە مێژوو بڕوانن، بە شێوەیەکی ئەکادیمییانە، لاپەڕەکانی مێژووی کورد برازێننەوە، پەنا بۆ ئەرشیف و بەڵگەنامەکانی کورد و بیانیی بەرن، بە دەسپاکییەوە بیانگوێزنەوە و بەکاریانبهێنن، دوور لە گرێوگۆڵی سایکۆلۆژیی، بەرژەوەندیی تایبەتی تاکەسیی، بنەماڵەیی و ڕێکخراوەیی، مێژووی نوێی کورد، بۆ نەوەکانی داهاتوومان، وەک چۆن هەیە، هەر بەو شێوەیەش تۆماربکرێ، ئەگینا مێژوویەکی زۆڵەک و پڕ لە درۆدەلەسەی لێ دەردەچێ. گەر ئەوڕۆش ڕووناکبیر، نووسەر و مێژوونووسان، لە بەر هەر هۆیە بێ، چاو لە ڕاستییەکان بنوقێنن، ئەوا زۆر دڵنیام، لە پاشەڕۆژدا، ڕۆڵە شارەزا و بە ئەمەکەکانی کورد، هەموو هەڵە مێژوویی یەکان ڕاستدەکەنەوە، مێژوویەکی ڕاستەقینە و گەشاوەی کوردمان بۆ تۆماردەکەن.

1998/08/08

تێبینیی :
دەقی ئەو کۆڕلانەی لە(یاداشت و چیم دی) یەوە وەرگیراوون، دەسکاریی ڕێنووسەکەیم کردووە، بەو شێوەیەی لەگەڵ ڕێنووسی ئەوڕۆدا بگونجێ.

# قەرز کۆن دەبێ، بەڵام نافەوتێ!

دوای ئەوەی بەلشەڤیکەکانی رووس، بە سەرکردایەتی لینین، لە (17/ئەکتۆبەری/1917)دا، کۆدەتا خوێناوییەکەیان بە سەرکەوتوویی بە ئەنجامگەیاند، دوا تزاری ئیمپراتۆریای رووسیا (نیکۆلای ئەلێکساندەرەڤیچ رۆمانۆف، 1894-1917)یان ناچارکرد، واز لە دەسەڵات و فەرمانڕەوایی بهێنێ. بەڵام لینین بەوەش وازی لێ نەهێنا، بەڵکوو هەموویان گرتن، پاشان بە شێوەیەکی نارەوا، خۆی، هاوسەرەکەی، منداڵەکانی، پزیشکی تایبەتیی خێزانەکەی و چەند دەسوپێوەندێکیان گوللەبارانکردن. دوای ئەوەی لاشەکانیشیان بە تێزاب سوتاندن، هەر بە کۆمەڵ لە گۆڕێکدا شاردیاننەوە.
ئێمە لێرەدا، لە هۆکارە سەرەکییەکانی، ئەم کردەوە خراپەی کۆمۆنیستەکان ناکۆڵینەوە، چونکە ئەوە کاری ئێمە نییە و دادگای مێژوومان بۆ لینین و هاوڕێکانی دانەناوە. بەڵام ئەوەی تا ئێستا، لە دوروتوێی پەرتووکەکاندا نووسراون، لە سەر زاران و لە نێو کۆمەڵانی خەڵکیدا بڵاوە، ئەوەیە، کۆمۆنیستەکان دەیانویست، بە یەکجارەکی کۆتایی بە دەسەڵاتی بنەماڵەی رۆمانۆف بهێنن، لاپەڕەیەکی نوێ، لە مێژووی نەتەوەی رووسدا هەڵبدەنەوە،

دەسەلات لە دەس کۆلاک، بۆرژوا و سەرمایەدارەکانی رووس بسێنن، دەولەتی کرێکار و جوتیار دامەزرێنن، ژێرخانی ئابووریی و کۆمەلایەتیی کۆمەلگەی رووس بگۆڕن، سیستێمێکی نوێی ئابووریی، لە گشت رووسیا و وولاتەکانی بندەسیدا بچەسپێنن.
هەرچەندە وا باویوو، لێنین لەو باوەڕەدابوو، تا یەکێ لە بنەمالەی رۆمانۆف لە ژیاندا بمێنێ، مەترسییەکی گەورە، بۆ سەر پاشەڕۆژی شۆڕشە پرۆلیتاریاکەیان پەیدادەکا. دوورنییە، ئەو بنەمالەیە دەسەلات پەیداکەنەوە و تۆلەی خۆیان بسەننەوە، دواتریش هەموو نەخشە و پلانەکانی لێنین و هاوڕێ بەلشەڤیکەکانی پوچکەنەوە. لەبەرئەوە، لێنین بڕیاریداوە، بە یەکجاریی و بۆ تاهەتایە، پاکتاویانکا. بەلام ئەز لەو باوەڕەدام، گەر ئەو بۆچوونەش ڕاستبێ، ئەوا بەشێکی زۆری هۆی ئەو کۆکوژییە، بۆ تۆلەسەندنەوە دەگەڕێتەوە. چونکە (برا گەورەکەی لێنین، ئەلێکساندەر ئیلیچ ئولیانۆف، لە ڕێکخراوێکی چەپی تیرۆریستی وەک نەرۆدنەیا ڤولیادا ـ ویستی گەل ـ کاری دەکرد. لە 1/مارسی/1887دا، یەکێ بوو، لەوانەی بەشداریی لە هەولی کوشتنی ئەلێکساندەری سێیەمی تزاری ڕووسیادا کرد. دوای ئەوەی ئەلێکساندەر ئولیانۆف گیرا، لە 8/مای/1887دا، لە سێدارەیاندا.) «18، 34-35» دیارە، ئەو ڕووداوە لە ژیانی لێنین و بنەمالەکەیدا، هەروا ڕووداوێکی کەم بایەخ نەبووە، بەلکوو بە پێچەوانەوە، تا ڕادەیەکی زۆر، کارێکی تەواوی لە هەست و هۆشی لێنین کردووە، پێوەندییەکی توندی، بە باری دەروونیی خودی لێنین خۆیەوە هەبووە، لە دل و دەروونی لێنیندا، گرێیەکی سایکۆلۆژیی گەورەی، بەرانبەر بنەمالەی ڕۆمانۆف دروسکردووە. بۆیە لە ژێر پەردەی لەنێوبردنی دەسەلاتی بنەمالەی ڕۆمانۆف و پاراستنی شۆڕشەکەیدا، بەو شێوە تراژیدیی و دڕندانەیە، درەختی ئەو بنەمالەیەی لە ڕەگوڕیشەوە هەلکێشاوە.
ئەم کارە، لە سەردەمی خۆی و تا دوارۆژەکانی دەسەلاتی کۆمۆنیستەکان لە یەکێتی سۆڤیەت، بە کارێکی باش و شۆڕشگێڕانە لە قەلەمدەدرا. بە شێوەیە کەسێ نەبوو، دەنگ بەرزکاتەوە و بتوانێ، بلێ: ئەم تۆلەسەندنەوەیە لەگەل باوەڕی ئاسمانیی و زەمینیدا ناگونجێ، لەگەل ڕەوشتی کۆمەلگەی

مرۆڤـایەتیدا ناکۆکـە! چونکە کـاتێ، یەکێ خۆی بە دەسـەوەدەدا و واز لە دەسـەڵات دەهێنێ، ئیـدی نابێ، بەو شـێـوەیە سـزای خـۆی، منداڵ، دەسوپێوەندەکانی بدرێ و گوللەبارانکرێن. پاشان بە مردوویش وازیان لێ نەهێنرێ، لاشەکانیان بە کەرەسەی کیمیاویی بشێوێندرێ.

هەرچەندە، مـاوەیەکی زۆر بە سـەر ئەم کـارەسـاتەدا تێـپـەڕیوو، بێ ئەوەی کەسێ لە ڕاستیی ئەو ڕووداوە ئاگاداربێ، تا لە ساڵی(1990 )دا، کۆمارە یەککرتووەکـانی یەکـێـتی سـۆڤـیـەت هەڵوەشـانەوە، پارتی کـۆمـۆنیـست لە دەسـەڵات کـەوت. ئیـدی کـۆمـەڵانی خـەڵک، وەک شـارە زەردەواڵە ورووژان، لەوە زیاتر نەیانتوانی، لە ئاستی کارەساتەکـاندا بێدەنگبن. ژۆرنالیـست و شارەزایانی مێژوو، بە سەرانسەری دەوڵەتی سۆڤیەتدا بڵاوبوونەوە، لاپەڕەی کـۆن و نـوێی مـێـژووی ئیـمـپـراتۆریای سـۆڤـیـەتیـان هەڵدایەوە، زۆر بە کـوڵودڵـەوە، بە دوای هەواڵەکـاندا دەگـەڕان، کـونوقـوژبنی ئەرشـیـڤی دەزگـا جۆربەجۆرەکانی دەوڵەتیـان دەپشکنی و وەک مریشک چینەیان تێدا دەکرد. پاشـان پەردەیان لەسـەر، هەمـوو هەڵەویەڵە و تاوانەکانی کۆمـۆنیـستـەکـان لادا، چەندین دەکـۆمـێنتی گـرنگیـان دۆزییـەوە، ڕۆژبەڕۆژیش لە بەرەوە بڵاویاندەکردەوە و کۆمێنتاریان لە سەر دەنووسی.

لەو سەردەمانەدا، هەر زوو تاوانەکانی کۆمۆنیستەکان، بەرانبەر ڕۆڵەکانی گەلانی سۆڤیەت لە قاودرا. بە تایبەتیی دەنگوباسی « تیرۆری سوور »، کە لە سەردەمی لێنیندا دەسپێکرد و لە سەردەمی ستالینیشدا، لە چڵەپۆپەیان تێـپـەڕاند، بە تەواویی گشت وڵاتەکـانی سـۆڤـیـەت و سـەراپای جـیـهـانی تەنییەوە. جگە لەوەی بە میلیۆنان خەڵکی بێچارەیان، لە کەمینەنەتەوەیی و گـەلانی جیـاجیـای نێـو سنووری چوارچێوەی ئیـمـپـراتۆریای سـۆڤـیـەت، دەربەدەر و پەرشوبڵاوکردەوە، لە زێدی خۆیان هەڵیانکەندن و ڕایانگوێزان، گرتووخانە و زیندانەکانی سیبیریایان، لە خەڵکی بێدەرەتان پڕکرد، چەندین میلیۆن کەسی بێتاوانیان گوللەبارانکرد. بەپێی هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی، مێژوونووسان، زانایانی کۆمەڵناسیی، پۆلێتیککاران و نووسەرانی یەکێتی سۆڤیەتی هەڵوەشاوە، پیشانیان داوە،(لە سەردەمی ستالیندا، نزیکەی 40 میلیۆن کەس لەناوبراوە.)«63،3».

یەکێ لەو فایلە کۆنانەی، دوای ئەم ڕووداوانە سەرلەنوێ هەڵدرایەوە، کارەساتی لەنێوبردنی بنەماڵەی ڕۆمانۆڤ بوو. هەر زوو دەنگوباسەکە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوکرایەوە، وەک دەکومێنتێ لە تیلیڤیزیۆندا پیشاندرا. دوای ئەوەی گۆڕەکەیان دۆزرایەوە، لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ، زانایانی ڕووس و بیانیی، لە سۆراغی ساغکردنەوەی پاشماوەی ئێسکەکانیان دان، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن، ئایا ئەو چەند پارچە ئێسکەی دۆزراونەتەوە، پێوەندیی بە بنەماڵەی ڕۆمانۆڤەوە هەیە؟

هەر لە ساڵی(1992)شەوە، دەمەتەقێیەکی زۆر توند، لە لایەکەوە لە نێوان پیاوەکانی کەنیسە، کۆمۆنیستەکان و کاربەدەسانی دەوڵەت، لە لایەکی دیکەشەوە، لە نێوان کۆمەڵانی خەڵکدا دروسبوو. پرسیارێ لە گۆڕێدا بوو، ئەویش ئەوە بوو، ئایا تەرمەکانیان بۆ گۆڕستانی تایبەتیی تزارەکان بگوێزرێنەوە؟ ئایا شایانی ئەوەن، لە تەنیشت گۆڕی باووباپیران و کەسوکاریانەوە، بە ڕێزەوە بنێژرێن؟! ئەوە بوو، دوای ئەوەی، بە هۆی هێندێ لە زاناکانی جیناتەوە سەلمێندرا، لە(90%) ئەو ئێسکانەی دۆزرانەوە، بۆ بنەماڵەی ڕۆمانۆڤ دەگەڕێنەوە، ئیدی بڕیاریاندا، زۆر بە ڕێزەوە بگوێزرێنەوە و لە شاری « پێترسبۆرگ » لە کەنیسەی « پێترۆپاڤلۆڤسکەیا »دا بنێژرێن.

هەرچەندە کۆمۆنیستەکان لەو سەردەمەدا، بە کردەوە کۆتاییان بە دەسەڵاتی بنەماڵەی ڕۆمانۆڤ هێنا، لە بنوبێخەوە دەسەڵاتی ڕامیاریی، سەربازیی و ئابووریان هەڵکێشان. بەڵام وا دیارە، بیریان لەوە نەکردبۆوە، ڕۆژێ لە ڕۆژان ناتوانن، تا سەر ڕاستیی لە جەماوەری گەل بشارنەوە، چونکە لە ڕووی مەراڵیی و ویژدانەوە، تاوانێکی گەورەی مێژوویی یان، بەرانبەر ئەو بنەماڵەیە کرد. هەروەها تا ئەمڕۆش نەیانتوانیوە، ناو و ناوبانگی ئەو بنەماڵەیە، لە بیر و هۆشی نەتەوەی ڕووسدا ڕیشەکێشکەن. بۆیە دوای ئەوەی ئەمڕۆ، زیاد لە هەشتا ساڵی ڕەبەق، بە سەر ئەو کارەساتە خوێناوییەدا تێپەڕدەبێ، جگە لە کۆمۆنیستەکان، کە تا ئێستا لە سەر بەندوباوی خۆیان ماون، جارێکی دیکە هێندێ لە پیاوانی ئایین و کەنیسە، کاربەدەسانی دەوڵەتی ڕووسیای فیدراڵ و زۆربەی ڕۆڵەکانی نەتەوەی

رووس، دانیان بەو تاوانەدا نا، داوای لێبووردنیان لە گیانی قوربانییەکانی بنەماڵەی رۆمانۆڤ کرد، پلەوپایەی کۆمەڵایەتیی و رامیارییان بۆ گێڕانەوە، زۆر بە رێزەوە، ئێسکەکانیان کۆکردنەوە، سەرلەنوێ بەپێی دابونەریتی ئایینیی خۆیان، لە(1998/07/17)دا، بۆ کەنیسەیان گواستنەوە و لە تەنیشت باووباپیرانی خۆیانەوە ناشتیانن. تەنانەت یەکێکی وەک « باریس نیکۆلایەڤیچ یەلتسن »ی سەرۆک کۆماری رووسیای فیدراڵ و هێندێ لە کاربەدەسانی دەوڵەت، بە شێوەیەکی رەسمیی، لەو رێورەسمەدا بەشدارییانکرد. هەر لەو کاتەدا، « یەلتسن » داوای لە رۆڵەکانی نەتەوەی رووس کرد، ئەو خەباتە خوێناوییەی، نزیکەی یەک سەدە لە رووسیادا بەردەوامبووە، لە بیر خۆیانی بەرنەوە، تا یەکێتیی، برایەتیی و خۆشەویستیی، جێگای بگرێتەوە.
بەو شێوەیە دەبینین، لە لایەکەوە، دادگای مێژوو سزای تاوانباران دەدا. لە لایەکی دیکەشەوە، بۆمان رووندەبێتەوە، ئەو مافەی بە نارەوا پێشێلدەکرێ، درەنگ بێ یا زوو، بۆ خاوەنەکانیان دەگەڕێتەوە. کورد راستی فەرمووە : قەرز کۆن دەبێ، بەڵام نافەوتێ. بۆیە ئەو مافە رەوایەی، پتر لە هەشتا ساڵێ دەبێ، وەک مار لە گەردنی نەتەوەی رووسەوە ئالابوو، بۆ خاوەنەکانیان گەڕاندەوە. ئەو قەرزە کۆنەی لای کاربەدەسانی دەوڵەتی رووسیا بوو، هەرچەندە کۆنیش بوو، بەڵام هەر نەفەوتا و دوا پەڕەی مێژووی تاوانەکانیان هەڵدایەوە .
لە روانگەی ئەم رووداوە گرنگە مێژوویی یەوە دەتوانین، سێ وانەی گەلێ بایەخدار هەڵهێنجین :
1. مێژووی رووداو و کارەساتە میللییەکانی هەموو رێکخراوێ، گەلێ، نەتەوە و کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو، هەروا بە ساختە تۆمارناکرێ. گەر لە سەردەمێکی دیاریکراویشدا، تاکە دیکتاتۆرێ یا رێکخراوێکی رەفتار فاشیی، بە ئارەزووی دڵی خۆی و بەپێی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی، چەند نووسەرێکی بەکرێگیراو، چەند پێنووسێکی خۆفرۆش راگرن، وەک دەیانەوێ، لاپەڕەکانی مێژوویان بۆ رەشکەنەوە، بە پێداهەڵدان و ستایشکردن، مێژووی خۆیان، بنەماڵە و رێکخراوەکانیان بۆ برازێننەوە، بە

شێوەیەکی ناڕەوا، درۆ بۆ نەیارەکانیان هەڵبەستن، ڕاستییە مێژوویی یەکانیان بۆ بشێوێنن، ناوەرۆکی پەرتووکە قەبە تەنگەنەستوورەکانیان، دژی دوژمن و نەیارەکانی خۆیان بۆ بناخنن، مێژووی تێکۆشان، ڕابردووی کەسێتیی و ڕابەرەکانی نەتەوەکەیان بۆ لەکەدارکەن، ئەوا جارێکی دیکەش، ئەم ئەزموونە نوێیەی ڕووسیای فیدراڵ، ئەوەی بۆ سەلماندینەوە، لاپەڕەکانی مێژوو، بە ئارەزووی چەند کەس و ڕێکخراوێ نانووسرێنەوە، شێواندنی مێژوو بەو شێوەیە، تاهەتایە سەرناگرێ، پەتی درۆ کورتە و ڕاستیی بۆ جەماوەری گەل هەر دەردەکەوێ، مێژووش بەو شێوەیەی هەیە و وەک گەل دەیەوێ،، خۆی دەسەپێنێ و دەنووسرێتەوە، ئەگینا مێژوویەکی ساختە و بێفەڕ دەردەچێ و بایەخی زانستیی خۆی لە دەستەدا.

بۆیە هەرگیز ڕێکخراو و پارتە ڕامیارییەکان ناتوانن، بە شێوەیەکی ئەکادیمیی، ڕووداوەکانی مێژوو تۆمارکەن، ناتوانن تاهەتایە مێژووی کارەساتەکانی، قۆناغە جیاجیاکانی نەتەوەکە بشێوێنن، چونکە چاوی مێژوو لە ئاستی هەڵە، تاوان و ناپاکییەکاندا تیژە، ڕۆڵە ڕووناکبیر و شارەزاکانی نەتەوە، زیت و وریان و نەنووستوون، هیچیان لێ تێکناچێ، هیچیان بە سەردا تێپەڕنابێ، کەسیش لە دەستی زەبری کوتەکی گورچکبڕی ڕاستەقینەی مێژوو، دەربازنابێ. لەبەرئەوە، ڕۆژێ هەر دێ، هەموو ڕاستییەکان بۆ ڕۆڵەکانی گەل دەرکەون، هەموو درۆودەلەسەکان ئاشکرابن، مێژووی ڕاستەقینەی ڕابەر، کۆمەڵە، ڕێکخراو، پارتە ڕامیاریی و سەرجەمی نەتەوەکە، بە شێوەیەکی ئەکادیمییانە، دادپەروەرانە، پڕ لە ڕاستیپەرستیی، بێ درۆودەلەسە و بوختان، بێ کەفوکوڵ و هەڵچوونی دەروون، دوور لە بەرژەوەندیی تاکەکەسیی، بنەماڵە و ڕێکخراوەکانیانەوە، بێ ئەوەی هەست و سۆزی نەتەوەیی کاریتێبکا، ئەو مێژووە پڕ لە سەروەرییە، بە هەموو هەڵەوپەڵەکانییەوە، بە هەموو نوچدان و سەرکەوتنەکانییەوە، بە هەموو لاپەڕە ڕەش و گەشەکانییەوە، وەک خۆی چۆن هەیە، هەر ئاواش بەو شێوەیە تۆماربکرێ.

2. هەروەها ئەم ڕووداوە، وانەیەکی دیکەمان بیردەخاتەوە، ئەویش ئەوەیە، بەری توندوتیژیی، توندڕەویی، پەرگیریی، کوشتنوبڕین و دیکتاتۆریی کورتە

و هەر کۆتایی دێ. هیچ گرفتێ بە جەنگی نێوخۆ و یەکدی سڕینەوە چارەسەرناکرێ، گەر بۆ ماوەیەکی کورت یا درێژیش، دەرگای ئەو تەنگوچەڵەمە نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئابووریی و کۆمەڵایەتییانە خەفەش بکرێ، ئەوا تا سەر ناتوانرێ، دەنگی جەماوەری گەل کپکرێ. بۆیە پێویستە، هەموو گرفتەکان بە شێوەیەکی دیمۆکراسیی، لە ڕێگەی دیالۆگی ڕامیاریی و دانوستانەوە چارەسەربکرێ، هەرگیزاوهەرگیز، پەنا بۆ بەر بەکارهێنانی چەک، یەکدی لەنێوبردن، کۆکوژیی و کودەتای سەربازیی خوێناویی نەبرێ.

3. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەم تاقیکردنەوە مێژوویی یە گرنگە، جارێکی دیکە ئەوەمان فێردەکا، ویست و ئارەزووی جەماوەری گەل، لە سەروو هەموو شتێکەوەیە، هیچ کاتێ هیچ دیکتاتۆرێ ناتوانێ، بەر بە کاروانی بەرەوپێشەوەچوونی گەل بگرێ، هەر کاتێ ڕۆڵەکانی گەل بیانەوێ، پەی بە ڕاستییەکان بەرن، بە هەر شێوەیە بێ، دەسیانپێیدەگا، بۆ کۆمەڵانی خەڵکی ڕووندەکەنەوە، دەسی چەپەڵ و خوێناویی تاوانبارانیش ئاشکرادەکەن و بە سزای مێژوویی خۆیان دەگەیەنن. تەنانەت دوای مردنیشیان، هەر کەسە نامەی کرداری خۆی بۆ دەخوێندرێتەوە، وەک چەند جارێ لە مێژووی یەکێتی سۆڤیەتدا ڕوویداوە.

لێرەدا پرسیارێ سەردەردەهێنێ، ئەویش ئەوەیە، ئەم ڕووداوە مێژوویی یە نوێیەی ڕووسیا، چیمان بیردەخاتەوە؟! لە وەڵامدا دەڵێین: لە کاتێکدا، لە ڕێگای دەزگای هۆکانی ڕاگەیاندنی نێو دەوڵەتانەوە، گوێمان لەم هەواڵە دەبێ، تاقیکردنەوەیەکی نزیک لەو بابەتەمان بیردەکەوێتەوە.

دوای ئەوەی کودەتا سەربازییەکەی(14/یولی/1958)لە عێراق ڕوویدا، هێندێ لە دانیشتووانی شاری بەغدا و چەند پارتێکی ڕامیاریی عێراق، پەلاماری کۆشکی پاشایەتییان دا، هەموو ئەوانەی دەسگیریانکردن، دەمودەس لەنێویانبردن. ئەو کاتە کۆمەڵانی خەڵک وایاندەزانی، بە لەنێوچوونی بنەماڵەی «شا فەیسەڵ» و دەسوپێوەندەکانی، هەموو شتێ کۆتاییدێ، بەهەشتی بەرین لە عێراقدا دادەمەزرێ، گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو دەخۆنەوە!

بەڵام دوای مـــــاوەیە، هەر ئەو جـــەمـــاوەرە بۆی ڕوونبـــۆوە، ئەوەی چاوەڕوانیاندەکرد، وا دەرنەچوو، بەڵکوو جگە لەوەی غەدرێکی زۆریان، لەو بنەماڵەیە کرد، ڕۆژبەڕۆژیش، بارودۆخی عێـراق بەرەو خراپتر ڕۆیی. بۆیە زۆربەی زۆری ئەو خەڵکە، پەشیمـانبوونەوە و سەردەمی کۆنیـان بە ئاوات دەخواست. تەنانەت سەرانی دەوڵەتی عێـراق و پارتی بەعس، دانیـان بەو هەڵەیەدا نا، سـەرلەنوێ بە ڕێزەوە گۆڕەکـانیـان بۆ هەڵبـەستنەوە. سـەیر ئەوەبوو، خوێنڕێژێکی سادیزمی وەک سەددام حوسێن، خۆی بەپێی خۆی سەردانی مەزارگەکانیانی کرد.

کاتێ ئەم گوتارە بەم بۆنەیەوە دەنووسین، مەبەستمان ئەوە نییە، داکۆکیی لە دەسەڵاتی بنەماڵەی تزارەکان بکەین، بەڵکوو مەبەستمـان ئەوەیە، هەموو گۆڕانکارییـە لە سـیسـتـێمی رامـیـاریی، ئابووریی و کـۆمەڵایەتیی هەر وڵاتێـکدا، دەتوانرێ، بێ خـــوێنڕشتن و بەکــــارهێنانی زەبروزەنـگ جێبەجێبکرێ. هەموو ئامانجەکانی گەل دەکرێ، بە شێوەیەکی دیمۆکراسیی بەدیبهێنرێ. بەلشەڤیکەکانیش، وەک دەسیـان بەسەر دەسەڵاتدا گرت، دەیانتوانی، ئەو بنەماڵەیە بەو شێوەیە پاکتاونەکەن. بەڵکوو لەبەرئەوەی، هەر زوو خـۆیان بە دەســەوەدا و وازیان لە دەســەڵات هێنا، تەنیـــا بەوە لێیــانبگەڕانایە، بۆ وڵاتێکی دیکەیان دوورببخـستنایەتەوە، وەک چۆن دەسەڵاتدارانی نوێ، لە میسـر « شا فاروق »، لە عێراق « عەبدولڕەحمـان عـارف » و لە زایری کۆن « مۆبۆتۆ سیـسیـسیکۆ »یان نەکوشت، بەڵکوو ڕەوانەی وڵاتێکی دیکەیان کردن، چونکە هۆی ئەو پاکتاوکردنە هەرچییە بێ، کـوشتنوبڕین و کـۆمـەڵکوژیی، بەپێی هەمـوو باوەڕ و یاسـایەکی نێـو دەوڵەتانیش بێ، بە تاوانێکی گەورە دادەنرێ.

1998/07/18

# بۆرە نەبێ، بازە بێ،
# کلک بە ئەندازە بێ!

ڕۆژی(1997/10/25) ، سەرۆکی INC ـ کۆنگرەی نیشتمانیی عێراق، دوکتۆر ئەحمەد چەلەبی، لە شاری ستۆکهۆلم، سیمینارێکی دەربارەی مێژووی دامەزراندن، چالاکیی، ڕەوشی INC و عێراق گرت. هەرچەندە دەبووایە، سیمینارەکە کاژێری یەکی پاش نیوەڕۆ دەسپێبکردایە، بەلام لەبەرئەوەی خەلکێکی زۆر کەم هاتبوون، لە کاژێری سێدا دەسپێکرد!
دوکتۆر بە ناو، خۆی بە سەرۆکی هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆن و سەرۆک کۆماری پاشەڕۆژی عێراق دەزانێ، کەچی لەوێ، مەگەر چەند عەرەبێکی برادەری خۆی ئامادەبووبن، ئەگینا لە (99%)ی بەشدارانی کۆڕەکە کوردبوون.
دوکتۆر زیاتر لەوە دەچوو، سەرۆکی هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆنی کوردستان بێ، وەک لەوەی ڕێبەری ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بێ!
ئەز وەک کوردێ، بە هیچ شێوەیە نەمتوانی، لە ئاستی هەموو ئەو شتانەی، پێوەندیی بە پاشەڕۆژ و کێشە ستراتیژییەکانی نەتەوەکەمەوە هەبوو، لە

ئاستی ئەو بیروباوەڕە شۆڤێنیی و هەڵە گەورانەدا بێدەنگبم. بۆیە لە شوێنی خۆیدا و زۆر بە کراوەیی وەڵامدایەوە. هەرچەندە هێندێ کوردپەروەری بێلایەنی دیکەش، وەڵامیاندایەوە، بەڵام لە لایەکەوە لەبەرئەوەی، کاتەکە کەمبوو، لە لایەکی دیکەشەوە، هەم لەبەرئەوەی وەڵامی پرسیارەکانی، بە هەڵەدەدایەوە و ڕێگاشیاننەدەدا، جارێکی دیکە وەڵامیبدرێتەوە، هەم وەڵامەکانیش بایی ئەوەندە نەبوون، هەموو لایەنێکی کێشە و باسەکان ڕوونبکەنەوە، لەبەرئەوە بە پێویستی دەزانم، لێرەدا هێندێ زانیاریی، دەربارەی دید و بۆچوونەکانی سەرۆکیINC و سەرۆک کۆماری پاشەڕۆژی عێراق ڕوونبکەمەوە، تا هاوزمانەکانم لەو بیروباوەڕە شۆڤێنییانە ئاگاداربن.
دیارە لێرەدا نامەوێ، بە دووروودرێژیی لە باسەکەی دوکتۆر بدوێم، بەڵام هێندەی قسە، دەمەتەقێ و وەڵامی پرسیارەکانی، پێوەندیی بە کێشە سەرەکیی و ستراتیژییەکانی نەتەوەی کوردەوە هەبێ، هەوڵدەدەم، بە کورتیی باسیانبکەم و لێیانبکۆڵمەوە.
ئەز هێندەی لە قسەکانی ئەو پیاوە تێگەیشتم، پیاوێکی زیرەک و بە توانایە، شارەزاییەکی تەواویی لە باری ئەوڕۆی پۆلێتیکی عێراق، نێوچەکە و جیهاندا هەیە. بەڵام دەربارەی کێشەی نەتەوەیی، چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی گەلانی بندەست و مافی چارەنووسی نەتەوەکان، تا بڵێی لە هۆش و بیردا پێخاوسبوو. جا نازانم، ئەو کاڵفامیی و نەزانییەی لەوەوە هاتبوو، وەک هەموو شۆڤێنییەکی بەرچاوتەنگی نەتەوەی سەردەست، لە ئاستی کێشەی کورددا، خۆی کەڕ و کوێر کردبوو، یا دەیویست، خۆی وا پیشاندا، پیاوێکی دیمۆکراسیی لیبرالی سەربەخۆیە و بڕوای بەوە هەیە، چەند گەلێکی دیاریکراو، لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی پەرلەمانیی لیبراڵدا پێکەوە بژین؟!!!
بە هەر شێوەیەبێ، هیچ لە باسەکەمان ناگۆڕێ، چونکە دوکتۆر بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، نە دانی بە بوونی گەلی باشووری کوردستاندا دەنا، نە بڕواشی بە خاکێ هەبوو، ناوی کوردستان بێ و نە هیچ مافێکیشی پێڕەوادەبینی. با لێرەدا، چەند نموونەیە لەسەر دید و بۆچوونەکانی، فەیلەسوف و پێشەوای هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بهێنینەوە.

دوکتۆر هەر لە سەرەتاوە، بە گیروگرفتەکانی گەلی عێراق و باکووری عێراق دەسیپێکرد. کەم جار زمانی تەتەڵەی دەکرد و ناوی کوردستانی عێراقی، لە دەم دەردەچوو. مەگەر لە بەر دڵی برا کوردەکەی تەنیشتی، دوکتۆر « لەتیف رەشید » ، ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان و جێگری سەرۆکیINC ، چەند جارێ ووشەی کوردستان بە دەمیدا هاتبێ، ئەگینا زۆربەی جار، هەر باکووری عێراقی بەکاردەهێنا. بە کورتیی دەتوانین، دید و بۆچوونەکانی دوکتۆر، لە چەند ڕستەیەکدا چڕبکەینەوە.
ئەوەی لای ئەو گرنگبوو، بەرژەوەندیی خۆی، INC و گەلی عێراق بوو، ئەویش خۆی لە ڕووخاندنی ڕژێم و دامەزراندنی دەوڵەتێکی دیمۆکراسیدا دەنواند. لە باسی مافەکانی گەلی کورددا، باسی مافی چارەنووسی کرد، بە مەرجێ ئەو مافە، لە چوارچێوەی سنووری عێراق دەرنەچێ، ڕێز لە یەکێتی خاکەکەی بگیرێ و پارێزگاریی یەکێتی خاکی عێراق بکرێ. بە تەواویی تێنەگەیشتین، ئەو فیدرالییەی بە گەلی باشووری کوردستانی ڕەوادەبینی، ڕەنگ و ڕووی چۆنە! لە وەڵامی چەند پرسیارێکدا، دەربارەی نێوچەکانی کەرکووک، خانەقین و ژەنگار ... تاد، زۆر بە ڕاشکاویی گوتی : هەرچەندە زۆربەی دانیشتووانی ئەو نێوچانە، لە کورد پێکهاتوون، بەڵام من ناتوانم، بڵێم : ئەو نێوچانە بەشێ لە کوردستان پێکدێنن، بەڵکوو بەشێکن لە عێراق. بەڵگەشی ئەوەبوو، گوایە لەو نێوچانەدا هەر کوردی تێدا ناژی، بەڵکوو عەرەب، تورکمان و ئاسووریشی تێدا دەژی. هەروەها دەیگوت : لە بەغداش نزیکەی یەک میلیۆن کورد هەیە، لەبەر ئەوە ناتوانین، شاری بەغداش بە شارێکی عەرەبیی دابنێین، بەڵکوو شارێکی عێراقە. پاشان چەند نموونەیەکی لە سەر ڕووسیا و ئەمێریکا هێنایەوە، کە لە ڕاستیدا، فری بەسەر باسەکەوە نەبوو، بەڵکوو زیاتر بۆ خۆقوتارکردنبوو. دوکتۆر بە هیچ شێوەیە، جیاوازیی لە نێوان گەلانی عێراقدا نەدەکرد. لە بری ئەوەی زاراوەی گەلانی عێراق بەکاربهێنێ، تەنیا زاراوەی گەلی عێراقی بەکاردەهێنا.
بەپێی زانستی جوگرافیای ڕامیاریی، فاکتەرەکانی هێزی دەوڵەت و بنەما سەرەکییەکانی جیۆپۆلیتیک، بەکارهێنانی زاراوەی گەلی عێراق، لە جێی خۆیدانییە. چونکە عێراق دەوڵەتێکی ناسیۆنال نییە. واتا عێراق لە یەک

گەلی هاودەنگ و هاوڕەنگ پێکنەهاتووە. بەڵکوو دەوڵەتێکی تێریتۆریالە، واتا لە چەند کەمینەی نەتەوەیی، گەل و نیشتمانێکی جیاواز پێکهاتووە. تەنانەت « عەبدولکەریم قاسم »یش، لە ڕۆژی(27/یولی/1958)دا، واتا تەنیا سیازدە ڕۆژ بە سەر کۆدەتاکەیدا تێپەڕبووبوو، ئەم ڕاستییەی ڕاگەیاند و لە دەستووری ئەو کاتەی عێراقدا نووسی :(عێراق نیشتمانی هاوبەشی عەرەب و کوردە)«17،2».

ئاشکرایە، ئینگلیزەکان لە ساڵی(1923)دا، دەوڵەتی عێراقیان دروسکرد. بە زۆر خوارووی کوردستانیان بە عێراقی عەرەبییەوە لکاند، کە تا ئەوڕۆش ئەو پێکەوەلکاندنە هەر بەردەوامە، جگە لەوەش، ناکۆکیی و پشێوی لە نێوان گەلانی عێراقدا لە ئارادایە. تەنانەت شا فەیسەڵ پتر لە شەست ساڵ لەمەوبەر، لە یاداشتە نهێنییەکانی خۆیدا تۆماریکردووە و دەڵێ:(هەتا ئێستا شتێ نییە، ناوی گەلی عێراق بێ، کە ئەمە دەڵێم، پەژارە دڵم دەجنێ. ئەوەی هەیە، جەماوەرێکی زۆری خەڵکانێکە، مرۆڤ ناتوانێ، وەبەر زەینی خۆی بدا. دڵیان لە هەستی نیشتمانیی خالییە، بەڵام سنگیان پڕە لە نەریتی ئایینیی، خورافات و هیچ پێوەندییەک پێکیانەوە گرێنادا. گوێڕایەڵی لایەنی شەڕن، بەرەو ئاژاوە ملدەنێن و لە هەموو میرییەک هەر چۆنێبێ، وەڕسن. ئێمە گەرەکمانە لەم جەماوەرە، « گەل »ێک پێکبهێنین، ڕاییێنین، فێریبکەین و خاوێنیبکەینەوە، کار وا بڕوا، ئەو هەوڵەی کە دەبێ، بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە وەگەڕبخرێ، ناشێ، بە خەیاڵدابێ.)«252،12»

لەبەرئەوە، لە ڕووی زانست و لۆژیکەوە، عێراق دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمانە، لە دوو گەلی سەرەکیی عەرەب و کورد، چەند کەمینە نەتەوەیی یەکی وەک تورکمان، ئاسووریی و ئەرمەنیی پێکهاتووە. لە ڕووی جوگرافیاوە، لە دوو نیشتمانی جیاوازی وەک عێراقی عەرەبیی و باشووری کوردستان دروسبووە. لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان، ئیمپریالیزم ئەم دوو گەل و دوو نیشتمانە جیاوازەی، لە نەتەوە و نیشتمانە گەورە ڕەسەنەکەی خۆیان دابڕی. بۆیە، هەر وەکوو چۆن، گەلی عەرەب لە عێراقدا، بە بەشێ لە نەتەوەی عەرەب و عێراقی عەرەبیش بە پارچەیە لە نیشتمانە پانوپۆڕەکەی عەرەب لە قەڵەمدەدرێ، بە هەمان شێوەش، گەلی کورد لە عێراقدا، بە

بەشێ لە نەتەوەی کورد و باشووری کوردستانیش، بە پارچەیە لە کوردستانی نیشتمانی کورد دادەنرێ. ئەمە وەک ڕاستییەکی مێژوویی و جوگرافیی، هیچ جۆرە دەمەتەقێ و گۆڕانکارییەک هەڵناگرێ، مەگەر چەند شۆڤێنییەکی عەرەبی وەک ئاغای چەلەبی و سەددام حوسێن، بەو ڕاستیی و لۆژیکە قەڵسبن و ڕەتیکەنەوە. عێراق وەک دەوڵەتێ، بە عەرەب و کورد و هەموو کەمینە نەتەوەیی یەکانییەوە، بە بەشێ لە نیشتمانی عەرەب دابنێن! بۆیە هەرگیز شتێ نییە، ناوی گەلی عێراق بێ، لەبەر ئەوە دەبێ، لە خۆمانەوە دەسپێبکەین و زاراوەی گەلانی عێراق بەکاربهێنین.
زاراوەی گەلی عێراق، ئێران، تورکیا، یۆگۆسلاڤیا و سۆڤیەت ... تاد لە بنەڕەتدا، دوو لایەنی دژ بە یەکی، وەک ئیمپریالیزمی ئینگلیزیی و کۆمۆنیستەکان، لە پێناوی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیاندا دایانڕشتووە. تا ئەو گەلانەی لە بندەستیاندان، لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتماندا کۆیانبکەنەوە. بۆ نموونە: یەکێتی سۆڤیەتی هەڵوەشاوە، زیاد لە سەد نەتەوە، گەل و کەمینەی نەتەوەیی تێدا دەژیا، کەچی هەر دەیانگوت: گەلی سۆڤیەت و بە گەلانی سۆڤیەت ناویاننەدەبردن. هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقیشەوە، ئینگلیزەکان ئەم زاراوەیەیان داناوە و تا ئەوڕۆ هەر بە هەڵە بەکاردەهێنرێ. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، ئەو هەڵەیە ڕاستکرێتەوە. چونکە گەر هەر کەسێ، بڕوا بەوە نەکا، عێراق لە چەند گەل و کەمینەیەکی نەتەوەیی جیاواز پێکهاتووە، واتای ئەوەیە، دان بە مافە نەتەوەیی یەکانی گەل و کەمینەکاندا نانێ و هەموویان تەنیا بە عەرەب دادەنێ. کەچی دوکتۆر، لەبەرئەوەی تا ئێستا، کەس ئەم ڕاستییانەی بە گوێدانەداوە، دەیگوت: ئەم قسانە هی نەتەوەیی یەکانە، گەلی عێراق هەر یەک گەلە و جیاوازیی لە نێوانیاندا نییە. جگە لەوەی بە ئاشکرا خۆی هەڵدەخەڵەتاند و نەیدەزانی، بیروباوەڕە شۆڤێنییەکانی خۆی چۆن لێفەپۆشکا، لە هەمان کاتیشدا دەیویست، بە زانیارییە ناڕاستەکانی، گوێی بەشدارانی کۆڕەکە بشاخنێ و باوەڕیان پێ بهێنێ. تەنانەت چەند نموونەیەکی لە سەر گەلی ڕووس و ئەمێریکا هێنایەوە، بە هیچ جۆرێ، لەگەڵ وەڵامی پرسیارەکان و مەبەستە سەرەکییەکەی خۆشیدا نەدەگونجا!

بەڵام بەداخـــەوە، لە کـــاتێکدا ئاغـــای چەلەبی ئەم دوڕ و گـــەوهەرانەی هەڵدەڕشت، مـیکرۆفـۆنەکـە بە دەس خـۆیەوە بوو، بە ئارەزووی دڵی خـۆی زانیاریی ناڕاستی بڵاودەکردەوە، لەوە زیاتر ڕێگایاننەدەدا، وەڵامی بدرێتەوە و ڕاستییەکان بۆ ئەویش و بەشدارانی کۆڕەکە ڕوونبکرێتەوە. ئەگینا ئەو کەسـەی کەمێ شارەزایی لە کـێشـەی نەتەوەیی و پێکهاتەی دەوڵەتەکانی جیهاندا هەبێ، بە ئاسانیی دەزانێ، ڕووسیای فیدراڵی ئەوڕۆ، دەوڵەتێکی ناسیۆنال نییە، بەڵکوو لە چەند گەل و کەمینەیەکی نەتەوەیی پێکهاتووە، هێندێکیان فیدراڵییان هەیە و هێندێکی دیکەشیان ئۆتۆنۆمییان هەیە. کە دەشکوترێ گـەلی ڕووس، تەنیـا مـەبەست لە گـەلی ڕووس خـۆیەتی، نەک هەمـوو ئەو گـەلانەی لە چوارچێـوەی دەوڵەتی ڕووسیـای فـیدراڵدا دەژین. چونکە کەس نالێ گەلی ڕووسیا، بەڵکوو دەڵێن، گەلی ڕووس، لەبەرئەوەی ڕووسیا ناوی خاک و دەوڵەتەکەیە و ڕووسیش ناوی نەتەوەکەیە.
گـەلی ئەمـێـریکاش، هەر کـەسێ دەربارەی دۆزینەوە و ئاوەدانکردنەوەی کیشوەری ئەمێریکا، کەمێ زانیاریی هەبێ، هەرگیز ئەو وڕێنانەناکا. چونکە ئەمـێـریکا، جگە لەوەی لە سـەردەمـێکی کـۆنەوە، نیشـتـمـانی هیندییە سوورەکان بووە، لە لایەن چەندین گەلی ئەوروپایی، ئاسیایی و ئەفریقاییەوە ئاوەدانکراوەتەوە. واتا وڵاتی پەنابەرانی گـەلانی جیـهـانی جیـاوازە و هەر یەکـەیان لە سـەردەمـێکی مـێژوویی دیاریکراودا، کـۆچیـانکردووە و لەوێ نیشـتـەجێـبوون، هەر گـەلەی زمـانی تایبـەتیی خۆی هەبووە و تا ئەوڕۆش، هێندێکیان هەر پاراستوویانە. بەڵام لە ئەنجامی پێکەوە ژیانی هاوبەشی پتر لە دوو سەدە، پێداویستییەکانی ژیان و ئەو سیستێمە دیمۆکراسییەی هەر لە کۆنەوە، لە ئەمێریکا پێڕەوکراوە، هەر لە سەرەتای ڕۆژەکانی داگیرکردنی ئەمـێریکا، لە لایەن بریـتـانیـای گـەورەوە، زمـانی ئینگلیـزیی وەک زمـانی دەوڵەت و زمـــانی هاوبەش، بە ســـەر ئەو گـــەلە کـــۆچکردووانەدا خـــۆی سەپاندووە. بۆیە گەلی ئەمێریکا، بارودۆخێکی تایبەتیی هەیە و گەلێکی هاوئاهەنگ نییـە. لەو بارەیەوە « سـاتیع ئەلحـەسـەری » دەڵێ: (دەوڵەتە ئەمـێریکاییەکـان، لە بارودۆخێکی جوگـرافـیی، مـێژوویی و کۆمـەڵایەتیی تایبەتیی و بەدەگـمەنی وادا دروسـبوون ... زۆربەی زۆری دانیـشـتووانی لە

کۆچەران پێکهاتوون. لە وڵاتە جیاوازەکانی جیهانەوە چوونەتە ئەوێ و لەگەڵ خۆیاندا، زمان، دابونەریت و خەسڵەتە نەتەوەیی یەکانی خۆیان گواستۆتەوە. لەبەرئەوە وڵاتەکانی ئەمیریکا، وەک بۆتەیەکی لێهاتووە، گەلە جیاوازەکان بە ڕێژە و چۆنیتی جیاواز، تێکەڵاو و ئاوێتەی یەکدی بوون و تواونەتەوە.)«66،14» جا وا دیارە، ئاغای چەلەبی دەیەوێ، گەلی کورد و کەمینە نەتەوەیی یەکانی دیکەی باشووری کوردستانیش، لە ژێر ناوی گەلی عێراق و لە بۆتەی گەلی عەرەبدا بتوێنێتەوە. لەوە دەچێ، جیاوازیی لە نێوان گەلە کۆچکردووەکانی ئەمیریکا و گەلی کورددا نەکا، کە ئەو گەلانەی ئەمیریکا خاکی خۆیان نەبووە و کۆچکردووبوون، بەڵام ئەوەتەی نەتەوەی کورد هەیە، لە کوردستانەکەی خۆیدا دەژی؟!! یا وا دیارە، ئەمیش وەک بەعسییە عەفلەقییە شۆڤێنییەکان، کورد بە کەمە نەتەوەیی و میوان، خاکی کوردستانیش بە پارچەیە لە نیشتمانی عەرەب دەزانێ، بۆیە پێویستە لە بۆتەی نەتەوەی عەرەبدا بتوێنەوە. بەعسییە عەفلەقییەکان لە خاڵی (11)ی دەستووری پارتەکەیاندا، دەربارەی کەمینە نەتەوەیی یەکان و گەلی کورد دەڵێن:(ئەوەی باسی کۆمەڵە ڕەگەزێکی دیکەی جیاواز بکا، یا دژی عەرەب کاری تێدا بکا، یا بۆ مەبەستێکی داگیرکەرانە هاتبێتە نیشتمانی عەرەب، لە وڵاتی عەرەب بەدەردەنرێ.)«8،13»

دەربارەی کێشەی کەرکوک و نێوچەکانی دیکەی باشووری کوردستانیش، ئەگەر ئەورۆ پیاوێکی وەک « ئەحمەد چەلەبی »، بەو هەموو بێدەسەڵاتییەی خۆیەوە، کەرکووک بە کوردستان نەزانێ، ئایا لە پاشەڕۆژدا دەتوانێ، بە شێوەیەکی ئاشتییانە و دیمۆکراسییانە، ئەو کێشە گەورەیە چارەسەربکا؟

ڕاستە تا کورد لە چوارچێوەی کۆماری عێراقدا بژی، کەرکووک هەر بە شارێکی عێراق دادەنرێ. بەڵام پێویستە، سنوورە جوگرافیی و سیما نەتەوەیی یەکەی، هەر لە ئێستاوە دیاریبکرێ. چونکە یەکێ لە پرینسیپەکانی، سیستێمی(ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی)ئەوەیە، دەبێ، جوگرافیای هەرێمە جیاوازەکان و سنووری ڕامیاریی، هەر نێوچەیەکی ئۆتۆنۆمیی یا هەرێمێکی فیدراڵیی دەستنیشانبکرێ. ڕاستە لە پارێزگای کەرکووکدا، جگە لە کورد، هێندێ کەمینەی نەتەوەیی وەک عەرەب،

تورکمـان، ئاسووریی و ئەرمـەنیی لێ دەژین، بەڵام ئەمـە ئەوە نـاگـەیەنێ، ئیدی ناسنامەی نەتەوەیی پارێزگای کەرکووک، هێندە ئاڵۆز و قورسبێ، بە هیچ شێوەیە دیارییەکرێ.
کەرکووک وەک هەمـوو شارێکی دیکەی ئەم جیهـانە، چەند کەمینەیەکی نەتەوەیی تێدا دەژی. بەڵام هەر وەک چۆن(مەککە و مەدینە)، بە دوو شاری عـەرەبسـتـانی سعـوودیە دادەنرێن، هەمـوو بەڵـگە و ڕاسـتـییـە مـێژوویی و جوگرافییەکانیش، ئەوە دەسەلمێنن، کە کەرکووک شارێکی کوردستانە.
هەروەها جگە لەو عەرەبانەی لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان، لە سنووری پارێزگای کەرکووکدا نیشتەجێکراون، کوردستان بە نیشتمـانی، هەموو ئەو کەمینە نەتەوەیی یانەش لە قەڵەمدەدرێ، کە لە مێژوویەکی کۆنەوە تێیدا دەژین. کەواتا وەک چۆن گەلی کورد لە باشووردا، بە بەشێ لە گەلی عێراق دانانرێ، هەروەها ئەوانیش بەشێ لە گەلی عێراق پێکناهێنن، وەک ئاغای چەلەبی دەیەوێ، ڕاستییەکان چەواشەبکا!
دوکتۆر لەبەرئەوەی، دان بە کوردستانێتی شاری کەرکووک و نێوچەکانی دیکەی باشووردا نەنێ، خۆی دەخەڵەتێنێ، خەریکە چارەنووسی شارێکی وەک بەغداش، کە پێتەختی عێراقە، دەخاتە مەترسییەوە. گەر بەو شێوەیە چارسەری گرفتەکانی گەلانی عێراق و دەوڵەتی پاشەڕۆژی عێراق بکا، دیارە سەرۆک و سەرکردەیەکی زۆر دڵسۆز، کارامە و بەرچاو ڕوونە و مانگە شەویش سەر لە ئێوارە دیارە!
بە لای منەوە، دوژمنی ئاشکرا، گـەلێ لە دوژمنی شـاراوە باشـتـرە و مەترسیی کەمترە. چونکە دوژمنێ بە ناوی دۆستایەتیی گەلی کوردەوە، لە ڕیزەکانی گەلدا خۆی حەشاربدا، مەترسیی لە دوژمنێکی ئاشکرا گەلێ زیاترە. سەددام بە ئاشکرا دژایەتیماندەکا، دەمانکوژێ، ڕامانـدەگوێزێ، ئەنفالماندەکا، کیمیاباران و ژاربارانماندەکا، کەرکووک و هەموو نێوچەکانی دیکەی باشووری کوردسـتـان، بە خاکی عەرەب دادەنێ. بەڵام وەک دەڵێن: ئاغای چەلەبی گورگە و لە پێستی مەڕدا خۆی حەشارداوە! جا ئەوە ئەوڕۆ، تەنیـا لە سـەر پارەوپوڵی ئەمـێریکا و بریتـانیـای ئاغـای دەلەوەڕێ، نە لە عـێراق و نە لە کـوردسـتـان، خاوەنی هیچ جۆرە دەسـەڵاتێکی ڕامیـاریی،

سەربازیی و ئابووریی نییە، قسەی تا بەر لووتی خۆی زیاتر بڕناکا، کەچی خاوەنی ئەو بیرە پوچ و دیدە گەندەڵانەیە، بەو شێوەیە دەدوێ و دەیەوێ، بە فشەمافێ هەڵمانخەڵەتێنێ. نەدی خوانەخواستە، ئەگەر سبەینێ دەسەڵات پەیدابکا و تەنیا خۆی بکوژ و بیبڕێ، دەبێ لە ژێر چارشێوی دیمۆکراسیی و دەوڵەتی لیبراڵدا، چی بە سەر گەلی باشووری کوردستان بهێنێ؟ تۆ بڵێی ئەم جارەشیان، سەد ڕەحمەت بۆ کفندزی پێشوو بنێرین؟!!

من وەک کوردێ، بە لامەوە گرنگ نییە، کێ لە بەغدا فەرمانڕەوایی دەکا، بەڵام ئەوەی بە لای منەوە گرنگە، پێویستە ئەو کەسە، دان بە هەموو مافە نەتەوەیی یە ڕەواکانی، گەلی باشووری کوردستاندا بنێ، وەک دەڵێن: با بۆرە نەبێ، بازە بێ، بەڵام کلکی بە ئەندازە بێ!

ئەز گلەیی لە دوکتۆر ناکەم، بەڵام ڕەخنەیەکی گەورە ئاراستەی سەرانی کورد دەکەم. چونکە پێش ئەوەی، لە سەر مافە ستراتیژییەکانی گەلی باشووری کوردستان، لەگەڵ ئەو پیاوەدا ڕێککەون، دەبووایە هەموو ئەو لایەنانەی بەشداریان، لە(INC)دا کردووە، هەر لە سەرەتاوە، هەموو شتێکیان لەگەڵدا یەکلاییکردایەتەوە، نەک هەموو کێشە گرنگ و ستراتیژییەکان، بۆ پاشەڕۆژێکی نادیار هەڵگرن. وا دیارە ئەو کۆڕ و کۆمەڵە ڕامیارییانە، پەندیان لە ڕێککەوتننامەکەی(11/مارس/1970) وەرنەگرتووە و هەرگیزاوهەرگیزیش کەڵک لە مێژوو وەرناگرن! لەوە دەچێ، کاغەزی سپییان بۆ پەنجەمۆر کردبێ، بە سەرۆکی خۆیان و هەموو گەلانی عێراقیشیان دانابێ، بۆیە ئەویش وا بەئاشکرا، ئەو هەموو بیروباوەڕە شۆڤێنییانەی بە سەر دانیشتوواندا هەڵدەڕشت، یەکێ لە نوێنەرەکانی (ی.ن.ک.) و (پ.د.ک.)، وەڵامێکیان نەدەدایەوە. تەنانەت دوکتۆر « لەتیف ڕشید »، لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو، لەو بارەیەوە دەنگ لە بەردەوە هاتبێ، دەنگ لەو پیاوەوە نەهاتووە! بە داخەوە، نوێنەرانی هەردوو زلهێزە کوردستان وێرانکەرەکە، لە تاو یەکدی سڕینەوە، پارە و دەسەڵات، کێشە ستراتیژیی و مافەکانی گەلی باشووری کوردستانیان لە بیرکردووە. لە بری ئەوەی داکۆکیی لە مافەکانی گەلی کورد بکەن، جلە کۆنە چڵکنەکانی خۆیان، بە تەنافی ئاغای چەلەبیدا هەڵدەواسیی و تەنیا لەو بوارانەدا قسەیاندەکرد، کە

پێوەندیی بە ڕێکخراوەکانی خۆیانەوە هەبوو، وەک ئەوەی کێشەی کورد، تەنیا لە ڕێکخراوەکەی خۆیاندا ببینن، شتێ نەبێ، ناوی گەلی کورد بێ، بەڵکوو لە باشووردا، دوو گەلی جیاوازی پارتی و یەکێتی هەبێ!
پێویستە سەرانی پارتیی و یەکێتی بە تایبەتیی، گەلی عەرەبی عێراق و گشت گەلانی دیکەی جیهان بە گشتیی، ئەو ڕاستییە باش بزانن، کێشەی کورد، هەروا کێشەیەکی لاوەکیی و زادەی بیری چەند سەرکردە و چەند ڕێکخراوێکی ڕامیاریی کوردستان و عێراق نییە، یا بە ئارەزووی چەند کەسێ دروسبووبێ، بەڵکوو کێشەی نەتەوەیەکی زیاد لە سی ملیۆن مرۆڤە، کێشەی نەتەوەیەکی داگیرکراو و دابەشکراوە، کە لە هەموو جۆرە مافێکی نەتەوەیی و دیمۆکراسیی بێبەشکراوە، کێشەیەکی نەتەوەیی و ڕامیارییە، پێویستی بە چارەسەرێکی بنەڕەتیی ئاشتییانە و دیمۆکراسییانە هەیە، تەنیا خۆشی لەوەدا دەبینێ، هەموو لاکان بێ جیاوازیی، دان بە مافی چارەنووسی نەتەوەی کورد، سەربەخۆیی ڕامیاریی و ئابووریی تەواویی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکگرتووی کوردستانیدا بنێن. هەموو مرۆڤێکی بەویژدان، پێشکەوتوخواز و دڵسۆز، بۆ نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی، پێویستە، دان بەو مافە سەرەکییانەی نەتەوەی کورددا بنێ.
ئەمە وەک پرینسیپێکی سەرکیی و تیۆریی، لە ڕووی مافی چارەنووسی نەتەوەکانەوە، هیچ جۆرە چەندوچوونێ هەڵناگرێ. بەڵام گەر تەماشایەکی بارودۆخی ئەوڕۆی کوردستان و ڕەوشی ڕامیاریی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی ڕێکخراوەکان و نەتەوەی کورد بکەین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ، لە ڕووی پراکتیک، توانا و دەسەڵاتەوە، ئەوڕۆ ئەو توانا گەورەیەمان نییە، تا لەم قۆناغەدا ئەو ئامانجە نەتەوەیی یانە بەدەسبهێنین. بۆیە پێویستە، لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا، لە مافی فیدراڵیی کەمتر داوانەکرێ، لەگەڵ هێزە بەرچاوروونەکانی ئۆپۆزیسیۆنی، گەلانی سەردەستەی ئەو دەوڵەتانەدا هەوڵبدرێ، دەوڵەتێکی دیمۆکراسیی فیدراڵیی دابمەزرێندرێ، بە مەرجێ دان بە هەموو مافە نەتەوەیی یەکانی، گەلی باشووری کوردستاندا بنێن، کە لەم قۆناغەدا خۆی لە فیدراڵیدا دەنوێنێ. بە تایبەتیی لە باشووری کوردستان، لە(1992/5/19)دا، پەرلەمانێکی شەرعیی لە لایەن گەلەوە هەڵبژێردراوە،

(له 4/ ئەکتۆبەری/1992شدا، ئەنجوومەنی نیشتمانیی کوردستان، بڕیاری لەسەر سیستێمی فیدرالّی بۆ گەلی باشووری کوردستان داوە.)»63،5» بۆیە هەر کەس و هەر لایەنێکی رامیاریی کوردستان، لەو بڕیارە لابدا و لێی پەشیمانبێتەوە، بە تەنیا لەگەڵ دەوڵەتی داگیرکەری عێراقدا، گفتوگۆ و دانوستان لەسەر مافەکانی گەل بکا، ئەوا تاوان و ناپاکییەکی گەورە، بەرانبەر نەتەوەی کورد دەکا.

لە کۆتاییدا دەڵێم: گەر ئەوڕۆ سەرانی ڕێکخراوە کوردستانییەکان، لە ئاستی « ئەحمەد چەلەبی » و هێزە بێدەسەلاتەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقدا نەوێرن، باسی مافە ڕەواکانی گەلی باشووری کوردستان بکەن، ئەو فیدرالّییەی خۆیان و پەرلەمانی کوردستان، بڕیاریان لە سەر داوە، پێیانبسەلمێنن، ئەدی دەبێ، لە ئاستی دڕندەیەکی وەک « عەلی کیمیاویی » و پیاوکوژێکی وەک « سەددام حوسێن »دا، چی بلێن و داوای چییان لێ بکەن؟! چۆنچۆنی گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکەن؟! بە چ شێوەیە ناوی کەرکووک، خانەقین و نێوچەکانی دیکەی کوردستان دەبەن؟ وا بزانم، گەر ئەو پیاوانە، بەو شێوەیە ڕەفتاربکەن، کورد پێویستی بەو سەرکردە، ڕووناکبیر و نووسەرانە نییە، کە لە ئاستی داگیرکەراندا بێدەنگدەبن و ماتومەلول ڕادەوەستن، ناتوانن، زار هەڵهێننەوە و داوای مافە ڕەواکانی گەل بکەن. کەچی لە کۆبوونەوە جەماوەرییەکاندا، کاتێ مەزاد لە سەر کێشەی کەرکووک گەرم دەبێ، بۆ ئەوەی کۆمەڵانی خەڵک لە خشتەبەرن، جەماوەر بە لای خۆیاندا ڕاکێشن، « مەسعوود بارزانیی »کەرکووک بە « دڵ »ی کوردستان دادەنێ و « جەلال تالّەبانیی »ش بە « قودس »ی کوردستانی لە قەڵەمدەدا! دیارە ئەو جۆرە کەسانە، بۆ یەکدی کوشتن، تالانکردن، ئاودیوکردن و کاولکردنی کوردستان، لە شێر بە هێزتر، لە پڵنگ بە هەڵمەتتر و لە ڕێوی زۆرزانترن، بەلام لە ئاستی دوژمنە سەرەکییەکانی نەتەوەی کوردیشدا، زار لە دەمیاندا نییە!

ئەوڕۆ کاتی ئەوە هاتووە، لە ڕاستیودروستیی و ڕەوایی کێشەکەمان، گەلانی دراوسێ و جیهان تێبگەیەنین، بە ڕاشکاویی هەموو داخوازییەکانی نەتەوەی کوردیان بۆ باسبکەین، تا وردەوردە، گوێیان بەو داخوازەییە ڕەوایانەی

نەتەوەی کورد ڕابهێنین. لە هەمان کاتیشدا، کاتی ئەوە هاتووە، گەلانی دراوسێشمان، چاوێ بە باوەڕ، نەخشە و پلانەکانی خۆیاندا بخشێننەوە، خۆیان لە هەموو دیدێکی شۆڤێنییانەی نەتەوەی بالادەست ڕزگاربکەن، تا هەموو پێکەوە، بە ئازادیی و بەختەوەریی وەک مرۆڤ بژین، دەوڵەتە هاوبەشەکانمان ئاوەدانبکەینەوە و کاروبارەکانیشی بە ڕێکوپێکی بەڕێوەبەرین، گەر بە ڕاستیی دەوڵەتەکانی تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا، وەک چوار دەوڵەتی فرە نەتەوە و نیشتمان وان، بە لانە و نیشتمانی هاوبەشی ئەو گەلانە دادەنرێن، ئەگینا یا لەوە زیاتر، نە خۆمان بخەڵەتێنین و نە کوڕی کوردیش، لە پێناوی برایەتیی درۆزنانەی گەلانی بندەست و سەردەستی هەر چوار دەوڵەتەکەدا، بە کوشت بدەین!

1997/11/01

تێبینیی :

ـ لە گۆڤاری « بەربانگ »ی ژمارە « 109 » سالی(1998 )دا بلاوکراوەتەوە.

ـ کاسێتی کۆڕەکەم لایە، جارێکی دیکەش گوێم لێگرتەوە، پاشان بە گوتارەکەدا چوومەوە، گوتم: تەنها هێندێ شت بە هەڵە تێگەیشتبم و غەدرم لە چەلەبی کردبێ!

ستۆکهۆلم
1995/07/25
بــەریزان :
سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی یەکگرتوو، مەسعوود بارزانیی
سکرتێری یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، جەلال تاڵەبانیی
سلاویکی کـوردانه
هەرچەنده پێشـەکی دەزانم، وەلامی ئەم نامەیەی منیش، وەک وەلامی ئەو چەند نامـانەی دیکەی لێدێ، کە تا ئێستا چەندین کەسی نیشتمـانپەروەری کـورد، چ لە کـوردسـتـان و چ لە هەندەران، دەربارەی ئەم جەنگە نێـوخۆییـه مـاڵویرانکەرانەیەی نێـوانتـان، ئاراسـتـەی بەڕێزتانی کـردووه. بەلام ئەز لە لایەکەوه، هەڵوێسـتی نەتەوەیی خۆم دەربارەی ئەو جەنگە چەپەڵه دەردەبڕم، لە لایەکی دیکەشەوه، وەک کـوردێ بە مـافێکی سـروشـتیی خـۆمی دەزانم، ئەگەر دەنگی ناڕەزایی خۆم دژی ئەو شەڕە خۆکوژییه بڵندبکەمەوه، چونکە لە ئاستی ئەو تاوان و کـارەساتە نەتەوەیی یە گەورەیەدا، بێدەنگیی کاریکی زۆر خراپە و نیشـانەی ڕەزامەندی جەماوەری گەلیش دەگەیەنێ، ئەگەرچی لە بێدەسەلاتیشدا بێ.
لێرەدا من نامـەوێ، لە هەمـوو مـەترسیی و زیانە گـەورە و گـرانەکـانی، ئەو جـەنگە چەپەڵەی نێـوانتـان، لە سـەر ئاسـتی نەتەوەیی و نێـونەتەوەیی بکۆڵمەوه، چونکە ئەو جۆرە قسانە زۆر وتراوه و زۆریشی لە سەر نووسراوه، زیانەکـانیـشی لای هەمـوو کـوردێکی خـاوەن هەست و بە هۆش و گـۆشـیش ڕوون و ئاشکران، کـە ئەنجـامی ئەو جـەنگە نێـوخـۆییـەی نێـوانتـان، چ مـاڵویرانییـەکی لە دوایه، بەلام دەمەوێ، سەرنجی بەڕێزتان بۆ چەند خاڵێکی گرنگ ڕابکێشم.
1. گـەر سـەرنجـێکی سـەرپێیی لە بارودۆخی ئەورۆی جیـهـان و پێـوەندیی ڕامیـاریی و ملـملانێی نێـوان هێـزە دژەکـانی جیـهـان بدەین، ئەوا زۆر بە ڕوونیی بۆمـان دەردەکـەوێ، جیـهـانی ڕامـیـاریی ئەوڕۆ و تەرازووی نێـوان هێزەکان بە تەواویی گۆڕاوه، ملـملانێی ئایدۆلۆژیی و جەنگی ساردی نێوان هەر دوو سـوپەرپاوەرەکـەی خۆرهەلات و خۆراوا کـۆتاییـپـێـهـاتووه. ئەوەی

جاران بە هەڕەشەکردن، تۆقاندن، خۆئامادەکردن بۆ جەنگی ئەتۆمیی و شەڕی ئەستێرەکان و ئاژاوەنانەوە، لە هەر قوژبنێکی ئەم جیهانەدا بەدیدەهات، ئەوڕۆ هەمووی بە دانیشتن، گفتوگۆ و دیالۆگی ڕامیاریی چارەسەردەکرێ، تا گۆڕانکارییەکی گەورەی دیکەی جیهانیش، جارێ هەر بەو شێوەیە دەمێنێتەوە.
2. لە بەر ڕۆشنایی ئەو ستراتیژە نوێیەی جیهاندا، ستراتیژی ڕامیاریی هەموو گروپ، پارت، شۆڕش، گەل و دەوڵەتەکانی دیکەی جیهانیش گۆڕاوە. ڕێکخراوەکان، دەوڵەتەکان، جگە لە گەلانی دواکەوتووی ڕۆژهەلاتی نێوەند، ئێستا بەرەو ئەوە هەنگاودەنێن، تەنانەت لەگەڵ دوژمنەکانیشیاندا، گیروگرفتە ڕامیاریی و نەتەوەیی یەکانیان، بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە و دێمۆکراسییانە چارەسەربکەن، بە دانیشتن لەگەڵ یەکدی و لە ڕێگەی دیالۆگی ڕامیارییەوە، هەوڵ بۆ دۆزینەوەی زمانیکی هاوبەش دەدەن، تا هەموو لایە پێکەوە لە ژێر چەتری پڕ لە هێمنیی و ئاساییشدا، لە نیشتمانە هاوبەشەکەی خۆیاندا بە ئازادیی بژین، نەک بۆ هەر گیروگرفتێکی ڕامیاریی، سەربازیی، ئابووریی ... تاد، پەنا بۆ بەر بەکارهێنانی چەک بەرن. ئەو ئامانجە نەتەوەیی، ڕامیاریی، سەربازیی و ئابوورییانەی، بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکانی گەلانی بندەستی جیهان دوێنێ نەیانتوانی، لە ڕێگەی جەنگی درێژخایەن و شەڕی پارتیزانییەوە، بە دەسیبهێنن، ئەوڕۆ ئەو ڕێکخراو و گەلانە، ستراتیژێکی نوێی دیکەیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە، چونکە سەردەمی بەکارهێنانی چەک، بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی نێوان پارت و هێزە ڕامیارییەکان، لە سەر فەرمانڕەوایی و دەسەلات لە مێژە بەسەرچووە، ئەو ستراتیژەش، ستراتیژی پێکەوە ژیانی هاوبەش، زمانی دیالۆگی ڕامیاریی، چارەسەرکردنی دێمۆکراسییانە و ئاشتیخوازانەیە، تا چارەسەرێکی مامناوەندیی بۆ هەموو گیروگرفتەکانی نێوان خۆیان بدۆزنەوە و بتوانن، پێکەوە هەڵبکەن.
3. سەرکردایەتی ڕامیاریی هەموو بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکانی جیهان، جگە لە سەرکردایەتی ڕامیاریی جوولانەوەی کورد، کەڵکیان لەم هەلومەرجە تایبەتییە نێونەتەوەیی و گۆڕانکارییە گەورە و گرانانەی سیستێمی نوێی

جیهانی وەرگرتووە، هەموو گیروگرفتەکانی نێوان خۆیان بە شێوەیەکی مۆدێرنانە، شارستانیانە و دیمۆکراسیانە چارەسەرکردووە. بۆ نموونە: ئەرتیرییەکان و فەلەستینییەکان، کە لە چەندین ڕێکخراوی ڕامیاریی جیاواز پێکهاتوون، لە سەر زۆر کێشە و باسی ئایدۆلۆژیی، ستراتیژیی، دەسەڵاتی ڕامیاریی و فەرمانڕەوایش ناکۆکن، بەڵام هەرگیز کارێکیان نەکردووە، دژی یەکدی پەلاماری چەک بدەن، دڵی دوژمنەکانیان بە خۆیان خۆشبکەن، هەلە مێژووییەکە بە دەسی خۆیان لەباربەرن. کەچی ئێمە بە پێچەوانەوە، هەرگیز پەندمان لە لاپەڕە ڕەشەکانی مێژووی نەتەوەیی پڕ لە شەرمەزاریی، ناکۆکیی، دووبەرەکیی، ناپاکیی و جەنگی نێوخۆی خۆمان وەرنەگرتووە، وا دیارە بەو زووانەش وەریناگرین!
4. سادەترین پرینسیپەکانی ئەلف و بێی زانستی پۆلێتیک و ستراتیژی سەربازیی، ئەوەمان بۆ ڕووندەکەنەوە، ئەگەر دوولای دژ بە یەک، ناکۆکیی، دووبەرەکیی و جەنگی خوێناوی لە نێوانیاندا ڕوویدا، ئەو دوولایە بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ، لە سەر کەلەپاچەکردن، پاکتاوکردن و لەنێوبردنی یەکدی بەردەوامبوون، لە سەر ئەوە سووربوون، لایەکیان لاکەی دیکەیان تەفروتونابکا، بەڵام هیچ لایەکیان نەیتوانی، بە سەر لاکەی دیکەدا سەرکەوێ، بە تەواویی لەنێویبەرێ، بەگوێرەی هەموو یاسایەکی ئاسمانیی و زەمینیی دەبێ، هەر دوولایان واز لەو جەنگە خوێناوییە بهێنن و ڕێگەیەکی دیکە بگرنەبەر، ستراتیژێکی دیکە بۆ چارسەرکردنی تەنگوچەڵەمەکانی نێوانیان هەڵبژێرن، کە ئەویش، ستراتیژی ئاشتی گشتیی، زمانی زانست، ژیریێژیی، پاراستنی وڵات، یەکێتی ڕیزەکانی گەلە.
بەڵام من لێرەدا، تەنیا ئەوەندە دەڵێم، جەنگی نێوخۆ لە باشووری کوردستاندا، ئەوا نزیکەی سی ساڵی ڕەبەقە، خەریکە ڕەگی قووڵی خۆی، بە تەواویی لە بیر و هۆشی هەموو مرۆڤێکی کورددا دادەکوتێ. سی ساڵی ڕێکە لە ژێر چارشێوی ململانێی ئایدۆلۆیی، قەوانی سواوی پێشکەوتنخوایی، کۆنەپەرستیی، پروپاگەندەی تیرەگەریتیی، کوردایەتیی، شۆڕشگێڕیی و بەرژەوەندیی گەلدا، ناکۆکیی، دووبەرەکیی و جەنگ، لە سەردەمی جیاجیادا و لە نێوان هەر دوولاتاندا بەردەوامە، سەرەڕای ئەوەی

گەلەکەمان، سی ساڵی پڕ لە کوێرەوەریی، نەگبەتیی، دەربەدەریی و وێرانکاریی بۆ ڕاکێشاون، کەچی هێشتا بە ختوخۆڕایی ڕۆڵەی ئازا و جوامێری کورد، بە دەسی یەکدی بە کوشتدەدەن، بەبێ ئەوەی، هیچ ئەنجامێکی چاوەڕوانکراوی هەبووبێ، بەبێ ئەوەی، تا ئێستا کۆتایی دیاربێ، بەبێ ئەوەی، هیچ کوردێ بە تەواویی بزانێ، ئەم جەنگە کوردکوژییە لە سەر چییە! ئایا لە ماوەی ئەو سی ساڵەدا، هیچ لایەکتان توانیوێتی، لا دژەکەی بەرانبەری لەنێوبەرێ؟ چارەسەرێکی بنەبڕیی بۆ ئەو نەگبەتیی و بەڵا گەورەیە بدۆزێتەوە؟ لە مێژووی چ نەتەوەیەکی ژێردەسدا ڕوویداوە، جگە لە مێژووی نەتەوەی کورد نەبێ، لە دووقۆڵەوە شەڕبکا؟ لە لایەکەوە، لەگەڵ داگیرکەر و لە لایەکی دیکەشەوە، لەگەڵ هێزەکانی نێوخۆدا، سی ساڵی ڕەبەقیش بە دەسی خۆی ڕۆڵەکانی بۆ گۆڕەپانی جەنگ و مەرگ بنێرێ؟ ئایا کەی واز لەو جەنگە دەهێنن؟ کەی کەمێ بیر لە بەرژەوەندیی بڵندی کۆمەڵانی ڕەشوڕووتی گەلەکەمان دەکەنەوە؟ خۆزگە بۆ گەلەکەمانتان ڕووندەکردەوە، ئەم شەڕوهەرایە لە سەر چییە؟ ئایا تاوان نییە، گەلێ ئەو هەموو قوربانییەی بۆ دابێ، بە سەدان جار دوژمنی بێگانەی داگیرکەر، دەسی بۆ ناموسی ژنان و کیژانی بردبێ، بە هەزاران شەهیدی دابێ، نۆ ئەنفالی گچکە و گەورەی دیبێ، کیمیاباران کرابێ، بە هەزار شەڕەشەق و کوێرەوەریی، لە دەم گورگی هاری بەعس ڕزگاری بووبێ، ئەو گەلەی ئێوەی لە ئاوارەیی سەر سنوورەکان و پایتەختی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان ڕزگارکرد، ئەوڕۆ ئێوەش بەو شێوەیە پاداشتی چاکەی بدەنەوە؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە، کەمێ بە خۆتاندا بچنەوە؟ چاوێ بە بەرنامە و ستراتیژی خۆتاندا بگێڕنەوە؟ بیرێ لە سکی برسیی ڕۆڵەکانی ئەو گەلە هەژارە بکەنەوە؟ تاکەی شەڕی یەکدی دەکەن؟ ئایا لایەکتان دەتوانێ، لاکەی دیکە بە هێزی چەک بە تەواویی لەنێوبەرێ؟

هەموو ئەزموونە قووڵەکانی، مێژووی گەلانی جیهان، ئەوەمان بۆ دەسەلمێنن، کە هیچ گیروگرفتێ، بە بەکارهێنانی چەک چارەسەرنەکراوە و ناکرێ، سەرکەوتنی هەمیشەیی و تا سەریش بۆ هیچ لایە نەبووە و نییە. کەواتە ئەم شەڕە خۆکوژییە بۆ؟ لە پێناوی چیدا دەکرێ؟ جگە لە بەرژەوەندیی دوژمنان و

داگیرکەرانی کوردستان، بەرژەوەندیی کێی دیکەی تێدایە؟ تا کەی درێژە دەکێشێ؟ ئەوەندە درێژەی کێشا، نەک ڕۆڵەکانی گەلەکەمان، بەڵکوو تەنانەت دۆست و دوژمنەکانیشمان لێی بێزاربوون. ڕۆژێ دەوەستێ و دووان شەڕە، دەردی برایەکی خۆشەویست لە کوردستانەوە نامەیەکی بۆ نووسیووم و دەڵێ: ئەم شەڕە کوردکوژییە وەکوو چیمەنی لێهاتووە، هەر دەیبڕی و سەرهەڵدەداتەوە. ئایا بیرێکتان لە سەرنجامەکەی کردۆتەوە؟ ئەگەر سبەی بەعسی ڕەفتارفاشیی داگیرکەر، پەلاماری کوردستانی دایەوە و داگیریکردەوە، ئێوەش هەر وەک جاران پەناتان بۆ بەر شاخ و کێوە سەرکەشەکانی کوردستان بردەوە، ئەو کاتە چی بە یەکدی دەڵێن و بە چ ڕوویەکەوە، داوای یارمەتیی و کۆمەک لە جەماوەری گەلەکەمان و ئازادیخوازانی جیهان دەکەن؟

5. دەبێ بەڕێزتان ئاگاداری ئەو بارودۆخە نێودەوڵەتییە بن، کە ئەوڕۆ بۆ بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی نەتەوەی کورد هاتۆتە گۆڕێ. گەلانی ئەورووپای مرۆدۆست بە گشتیی و دەوڵەتە دێمۆکراسیی و ئاشتیخوازەکانی جیهان بە تایبەتیی، ئامادەن هەموو جۆرە یارمەتییەکمان بدەن، کوردستانمان بۆ ئاوەدانبکەنەوە، گەلەکەمان لە دەس هەڕەشەی مەرگ و برسێتیی ڕزگاربکەن، جارێکی دیکە نەهێڵن، سەربازە دڕندەکانی سوپای داگیرکەری بەعس، بە ئارەزووی خۆیان لە کوردستاندا کوشتنوبڕین بکەن، ئەویش بە مەرجێ، خۆمان شت بین، یەک بین، کۆک و برا و تەبا بین، ئەگینا ئەگەر خۆمان لە نێو خۆماندا وەک کەوی خۆخۆر هەڵسوکەوت بکەین، بێگانە با دۆستیشمان بن، بۆچی دەبێ، لە خۆمان زیاتر، دڵیان بە ئێمە بسووتێ؟! لە هێندێ سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە بیستوومە، دەوڵەتەکانی ئەورووپا، ئەمێریکا، کەنەدە، ئوسترالیا ئامادەن، دەسی یارمەتی بۆ گەلەکەمان درێژکەن، کوردستانمان لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ ببوژێننەوە، بەڵام بە مەرجێ ئەو جەنگە چەپەڵەی نێوان پارتی و یەکێتی بوەستێ و کۆتاییپێبێ. چونکە دەڵێن: تا جەنگ و کوشتنوبڕین لە کوردستاندا هەبێ، ئەوان ئامادەنین، یارمەتیمانبدەن، ڕۆژبەڕۆژیش، لە بەرنامەکانی خۆیان پاشگەزدەبنەوە. دکتۆر(نەجمەدین)سەرۆکی کۆنگرەی نیشتمانیی کورد لە ئەمێریکا، لە

چاوپێکەوتنێکی تێلێـفـیـزیۆنی « مـەد »دا، زۆر بە ڕاشکاویی گـوتی: کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمێریکا دەڵێن: ئەم جەنگە نێوخۆییەی لە باشووری کوردستـان بەرپابووە، دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی دوادەخا. بۆیە کـورت و کـرمـانجـیی دەڵێم: هەر کـەسێ، هەر لایە، هەر پارتێکی ڕامیاریی کوردستان، هەلە مێژووییەکە لە کیس گەلەکەمان بدا، بە تەواویی دەسـبـخاتە بینی فـیـدرالییـەکـە و ئەم تاقـیکردنەوە گرنگەی گـەلەکـەمـان بخنکێنێ، دژی ئاوات و ئامانجە پیرۆزەکانی نەتەوەکەمان ڕابوەستێ، ئەوا لە مێژووی نەتەوەکەماندا، ناپاکییـەکی گەورە بۆ خۆی و ڕێکخـراوەکەی، تۆماردەکا، جا ئێدی هەر کەس، هەر لا و هەر پارتێکی ڕامیاریی کوردستان دەبێ، با بێ.

6. ئەز پێـموایە، ئەورۆ، کلیلی شـەڕ و ئاشـتیی، چ لە نێـوخـۆ و چ لەگـەڵ داگـیـرکـەراندا، بە دەس سـەرکـردایەتی پارتی و یەکـێـتـیـیـە، لە سـەرو هەمـووشیـانەوە بە دەس بەڕێزتانە. جا ئەگـەر کەمێ، بەزەییتان بە کۆمەڵانی ڕەشـوڕووتی گـەلەکـەمـاندا بێـتـەوە، بەرژەوەندیی بـڵندی بزووتنەوەکـە و نەتەوەکە، پێش بەرژەوەندیی تاکەکەسیی، بنەماڵەیی و پارتایەتی تەسکەوە بخـەن، ئەوا هەمـوو ئامـانجـەکـانمان دێتـەدێ، ئاواتە دێرینەکـانی دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستـانیش، گۆڕدەکرێن. چونکە تەنیـاوتەنیـا ئێـوە دەتوانن، بڕیاربدەن و ئەو جـەنگە ناهەمـوارە ڕابوەسـتێنن، چارەسـەرێکی بنەڕەتیی، بۆ ئەو بارودۆخـە ئاڵۆزەی کـوردسـتـان بدۆزنەوە، ئەگـەر ئەوە نەکـەن و لە سـەر هەمـان ڕێـبازی شەڕخوازیی خۆشتـان بەردەوامبن، پێش هەمـوو کـەسێ، ئێـوە بەرامبەر خوا، خوێنی شەهیدان، دادگای گەل و مێژوو بەرپرسیاردەبن.

7. تاکوو ئێـسـتـا گەلێ گوتار و نامیلکەم، لە سەر جەنگی نێوخۆ نووسیوە، لە هەمــوو ئەو نووسـیـنانەشـدا، هەر دوولام وەک یەک تاوانبـارکـردووە. تەنانەت هێندێ کەس گلەیی ئەوەم لێـدەکەن، دەڵێـن:چۆن دەبێ، هەر دوولا وەک یەک سـەیربکرێ؟ هەر دوولا وەک یەک بکوترێ؟ لە وەڵامـدا دەڵێم : هیچ لایەنێ لەو دوولایەنە شەڕکەرە، فریشتەی ئازادیی و بووکی دیموکراسیی نین، تا نوێژ لە سـەر دامـێنیـان بکرێ، لایەنەکـەی دیکەشـیـان ئەهریمەنی شەڕخوازیی و دیکتاتۆریی بێ، تا بە هەموو شێوەیە نەفرەتی لێ بکرێ.

لای من تەنیا گرنگ ئەوەیە، خوێنی کورد بە دەسی کورد نەڕژێ، هەموو گیروگرفتەکانی نێوان باڵەکانی بزووتنەوەی کوردایەتیی، بە ڕێگەیەکی ئاشتیخوازانە، دیمۆکراسییانە و شارستانییانە چارەسەربکرێ، واز لە یاسای جەنگەڵ بهێنرێ، حوکومەتە فیدرالییەکەم لە کیس نەچێ، منداڵانی کورد چیدیکە ئەنفال و کیمیاباران نەبیننەوە، جا ئیدی کێ دەبێ بە بەگ و پێشڕەو، کێی دیکەش دەبێ بە قڕە و پاشڕەو لە کوردستاندا، بە قەدەر سەرە دەرزییەک دڵی من داناخورپێنێ! بۆیە لە نێوان دیکتاتۆریی و دیمۆکراسیدا، لە نێوان جەنگ و ئاشتیدا، لە نێوان ناپاکیی و نیشتمانپەروەریدا، هەمیشە دژی دیکتاتۆریی، جەنگ و ناپاکیم. دیمۆکراسیی، ئاشتیی و نیشتمانپەروەریش هەڵدەبژێرم. بەرژەوەندیی نەتەوەکەم لە کوێ بێ، پەل بۆ ئەوێ دەکوتم. ئەوڕۆ بەرژەوەندیی نەتەوەکەم، لە شەڕی کوردکوژیدا نییە، بۆیە دژی ئەو شەڕە چەپەڵەم و بە هەموو شێوەیە گلاویدەکەم، دژی هەموو گێرەشێوێن، ئاژاوەچیی، هەلپەرست و شەڕخوازێکیشم، کە دەیانەوێ، دەلاقەی ناکۆکییەکانی نێوان ڕیزەکانی گەل ئاواڵەتربکەن، زامەکان قووڵتربکەن.

بەڵام لێرەدا پرسیارێ خۆی دێنێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە، ئەگەر ئەم جەنگە کوردکوژییە لە سەر ئەوەبێ، لایەکتان بیەوێ، کوردستانمان بۆ ڕزگارکا و دەوڵەتێکی ناسیۆنالی سەربەخۆی یەکگرتووی کوردستانیی دابمەزرێنێ، لاکەی دیکەشتان دژی ئەو بیروباوەڕ و ئامانجە ستراتیژیانەی گەلەکەمان ڕابوەستێ، بیەوێ، داگیرکەری بەعس بۆ کوردستان بگێڕێتەوە، ئەوا لەو کاتەدا دەبێ، هەموو کوردێکی بە ویژدان و نیشتمانپەروەر، هەڵوێستێکی نەتەوەیی ڕوون و ئاشکرای هەبێ، هەر کوردێکیش، هەرچییەکیش بکا، لە پێناوی بەدیهێنانی ئەو ئامانجە پیرۆزانەدا، ڕەخنەی لێ ناگیرێ. بێگومان دەشبێ، پشگیریی ئەو لایە بکرێ، کە بانگی سەربەخۆیی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی، بە گوێی ڕۆڵەکانی گەلەکەماندا هەڵدەدا و لاکەی دیکەش ڕیسوابکرێ. ئەو کاتە ئەو شەڕە، نە بە شەڕی براکوژیی، نە بە شەڕیی کوردکوژیی، نە بە جەنگی نێوخۆ و نە بە هیچ جۆرە شەڕێکی دیکەش لە قەڵەمدەدرێ، شەڕەکەش شەڕێکی چەپەڵ

نابێ، بەڵکوو بە شەڕێکی پیرۆز و ڕەوا دادەنرێ، چونکە شەڕەکە لە نێوان بەرەی گەل و بەرەی دوژمنانی گەلدا دەبێ. بەڵام هەرچەند باڵی بیرم لێکدەدەم، ئەو شەڕە سی ساڵییەی نێوانتان، جگە لەوەی شەڕێکە لە پێناوی دەسەڵات، پاوەنخوازیی و پارەدا دەکرێ، هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی دیکەی نەبووە و نییە.

سەیر ئەوەیە، ئەوەندەی خاڵی هاوبەشیش، لە نێوانتاندا هەیە، ئەوەندە خاڵی ناکۆک، لە دید و بۆچوون و ئامانجە ستراتیژییەکانی نێوانتاندا نییە! ئەگەر وا نییە و نکولی لێدەکەن، ئایا هەر دوولاتان داوای فیدراڵیی بۆ باشووری کوردستان و دیمۆکراسیی بۆ عێراق ناکەن؟ ئایا هەر دوولاتان، داوای هەڵبژاردن لە کوردستان و عێراقدا ناکەن؟ ئایا هەر دوولاتان، بڕواتان بە خەباتی نێوکۆیی و هاوبەشیی نێوان هەر دوو گەلی عەرەب و کورد لە عێراقدا نییە؟ ئایا هەر دوولاتان بە نۆرە، سەردەمێ لە کوردی خۆرهەڵات و سەردەمێکی دیکەش، لە کوردی باکوورتان نەداوە؟ ئایا هەر دوولاتان، پێوەندیی گەرموگورتان لەگەڵ هەموو داگیرکەرانی کوردستاندا نەبووە و نییە؟ ئایا هەر دوولاتان، چاوەڕوانی سۆز و بەزەیی بەرەی ڕۆژاوا نین؟ خۆ ئێستاش جاران نییە، لایەکتان سەر بە یەکێتی سۆڤیەت و لایەکەی دیکەشتان سەر بە ئەمێریکا بن، تا بڵێن: لە سەر ئەوە ناکۆکین! ئایا هەر دوولاتان، لەو هەموو نەگبەتیی، کارەسات، تێکشکاندن و نوچدانەی، بە سەر گەلەکەماندا هاتووە، بەرپرسیارنین؟ باوەڕیش ناکەم، بیروباوەڕی ئازادیی و دیمۆکراسییش، لە گیرفانی هیچ لایەکتاندا، سەوزەڵەخانم بۆ گەلی کورد بچڕێ! ئیدی ئەم شەڕوهەرایە لە سەر چییە؟ کەی ئەم مەتەڵە قورس و گرانە، بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد هەڵدەهێنن؟

8. چەند کارێکی باشبوو، کاتێ ژەنەراڵ بارزانیی، لە ساڵی1970دا، لێخۆشبوونێکی گشتیی، بۆ هەموو نەیارەکانی خۆی دەرکرد، ئاوێکی بە ڕەحمەتی بەو ئاگری چوار ساڵەی جەنگی نێوخۆی باشووری کوردستاندا کرد، ڕیزەکانی پارتی و گەلی کورد یەکیانگرتەوە.

بە لای منەوە، ئەو کارە بە نرخەی بارزانیی، بە یەکێ لە هەرە کارە گەورە و گرانەکانی دادەنرێ. کەچی ئێوە دەتانەوێ، ئەوەی بارزانیی دروستیکرد،

سەرلەنوێ تێکیبدەنەوە، گیانی پاکی لە گۆڕی بێنارامیدا ئازاربدەن. ئەدی ناکرێ، لە بری ئەو هەموو خوێنڕشتن و جەنگە چەپەڵانە، پەندێ لە سەراپای مێژووی، پڕ لە شەڕوشۆڕی نەتەوەی کورد بە گشتیی و مێژووی ئەم سی ساڵەی، جووتە شۆڕشی گەلەکەمان، لە باشووری کوردستاندا بە تایبەتیی وەربگرن؟ چاو لەو هەنگاوە چاکەی سەرۆک بارزانیی بکەن، کەمێ لێبووردن و نەرمونیانیی، لەگەڵ هاوزمان و هاوخوێنەکانی خۆتاندا بەکاربهێنن، واز لە دڵڕەشیی، کۆنەقین، توندڕەویی، کەللەڕەقیی، کورسیپەرستیی و ئاژاوەی نێوخۆ بهێنن و کوردستانمان بۆ بکەن بە ماستی مەیو؟!
لە کۆتاییدا دەڵێم: من لێرەوە بۆ وەستاندنی ئەو شەڕە، هیچ جۆرە پێشنیازێکم نییە، چونکە ئەوەندەمان پێشنیازکرد و کەس وەڵامینەداینەوە، کارەکە بە تەواویی بێلەزەتبوو. بەڵام ئێوە، خۆتان لە ئێمەی باشتر دەزانن، کە بۆ بنەبڕکردنی ئەو جەنگە نێوخۆیی یە، پێویستە چێ بکرێ و چی باشە.
تەنیا ئەوەندە دەڵێم: ئەو شەڕە چەپەڵە، یەک ڕۆژ زووتر بوەستێندرێ، هێشتا هەر درەنگە، یەک دڵۆپ خوێن کەمتر بڕژێندرێ، هێشتا هەر زۆرە. دواکارم لە بەرێزتان، تا هەموو شتەکانیشمان بە یەکجاریی، لەدەستنەچووە، چاوێ بە بەرنامە و پلانەکانی خۆتاندا بخشێننەوە، منیش لە پێناوی یەکێتیی و تەبایی ڕیزەکانی گەلی کورددا، وەک کوردێکی ئاوارەی بێلایەن، ئامادەی هەموو خزمەت و کارێکی چاکم.
دوا جار بۆ هەوڵی ئاشتیی، برایەتیی و تەبایی، هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم.

دوکتۆر حوسێن محەممەد عەزیز

تێبینیی :
ـ ئەم نامەیە، لە شاری ستۆکهۆڵم، بە دەستی بە هەر دوو نوێنەری پارتی(تەها بەروارییی) و یەکێتی(ئاسۆگەرمیانیی)دراوە. جا خۆیان و خوای خۆیان، ناردویانە یا نەیان ناردووە، ئەوەیان پێوەندیی بە منەوە نییە!
ـ دەقی ئەم نامەیە بۆ (ئەوشیروان مستەفا) لە لەندەن پۆستکراوە.
ـ لە کاتی خۆشیدا، کۆپیکراوە و بۆ هێندێ دۆست و برادەری نزیک ڕەوانەکراوە.

## سەرچاوەکان :


1 . احمد خواجه، چیم دی، ب1 ، چاپی یەکەم، چاپخانەی شفیق، بغداد، 1968.
2. جمال نبز، حول المشكله الكرديه،1969.
3. حوسێن محەمەد عەزیز، ململانێی ئایدۆلۆژی لە کوردستاندا، ستۆکهۆلم، 1995
4. حوسێن محەمەد عەزیز، کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، سوید، 1996،
5. حوسێن محەمەد عەزیز، فیدرالیزم و دەوڵەتی فیدراڵ، سوید، 1996
6. حوسێن محەمەد عەزیز، گیروگرفتە سەرەکییەکانی کورد، سوید، 1998، ل 80.
7. رفیق حلمی، یاداشت، کوردستانی عراق و شۆڕشەکانی شێخ محمود، بەشی یەکەم، چاپی دووەم، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، هەولێر، 1988 .
8. شەرەفخانی بدلیسی، شەرەفنامە، هەژار کردوویە بە کوردی، 1972 .
9. کریس کۆچێرا، مێژووی کورد لە سەدەی 19-20دا، وەرگێڕاوی محمد ربانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی کارون، ئێران، 1369، ل 595.
10 . د. کەمال مەزهەر، ویژدان و مێژوو ... یان دادگەی موشیری حەمەی سلێمان، مانگنامەی پەیام، ژمارە 8، بنکەی راگەیاندن و بلاوکردنەوەی رەسەن، 8/پووشپەڕ/1998، لەندەن، ل24.
11. ن. ا. خەلفین، خەبات لە رێی کوردستاندا، وەرگێڕانی : جەلال تەقی، چاپخانەی راپەرین، سلێمانی، 1971 .
12 . جمهوريه الخوف، الترجمه الكامله(سمير الخليل و احمد رائف) مطبعه الزهراء، الطبعه الاولى، القاهره، 1991
13. دستور حزب البعث العربي، مطبعه الاعتدال، دمشق،
14. ساطع الحصري، ما هي القوميه؟ بيروت، نيسان1985
15. نبيل الملحم، سبعه ايام مع ابو قاند و شعب، الطبعه الاولى، داراخيل للطباعه و النشر و التوزيع، اثينا ـ اليونان، 1996، ل290.
16 . القدس العربي، ژمارە2931، 1998/10/13
17 . الوسط، العدد 324، التاريخ 1998/4/13
18. Gunnar Gunnarson, Lenin, Tidensforlag, Stockholm, 1970, P 215

## له بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

گوتـــار :

1/ بەرەو ئازادی، ڕابوون، ژمارە 2، سوید، 1991، ل 46

2/ لە پێناوی ڕاسـتـیـدا، بەربانگ، ژمـارە 87، سـالی 12، سـوید، 1993،ل48

3/ یەکـێـتی سـۆڤـیـەتی هەڵوەشـاوە لە ڕوانگەی بەرژەوەندییـەکـانی نەتەوەی کـوردەوە، ڕابوون، ژمارە7 ـ 8، سوید، 1993، ل67

4/ دەربارەی کەسایەتیی کورد، ڕابوون، ژمارە 10ـ11، سوید،1994 ل71

5/ بەرەو ستراتیژێکی یەکگرتووی نەتەوەیی، هەنگاو، ژمارە 13، لەندەن،1995ل7

6/ سایکۆلۆژییەتی مرۆڤی ئاوارەی کورد و بازاڕی چاپەمەنی کوردی، گزینگ، ژمارە8، سوید،1995، ل30

7/ لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی کۆمەڵگەی کوردەواری، گزینگ، ژمارە 9،1995، ل48

8/ کـۆرپە تاقـانە سـاواکـەی دەنگ و ڕەنگی نەتەوەکـەم( MedTV)، گـزینگ، ژمـارە 13، سوید، 1996.

9/ هەنگاوی یەکـەم و سـەرەتای کـارێکی مـەزن،بەربانگ، ژمـارە 102، سـالی 14، سوید، 1996،ل51

10/ چەند سەرنجێ دەربارەی سـەرەخۆشی و پرسـەدانان، بەربانگ، ژمارە 104، سـالی 15، سوید، 1997،ل22

11/ دیکتـاتۆرەکان لە بەر یەک ئاوێنە، قژی نەخشـە و پلانەکانیان دادەهێنن،بەربانگ، ژمـارە 105، سـالی 15، سـوید، 1993،ل39. گـۆڤـاری دیمـۆکـراسی، ژمـارە30، سالی7، کوردستان ـ سلێمانی، تشرینی یەکەمی1997، ل16.

12/ کـەی هۆشێ بە بەر خۆمـاندا دەهێنینەوە؟ بەربانگ، ژمـارە 106-107، سـالی 15، سوید، 1998،ل23. گۆڤـاری دیمـۆکراسی، ژمـارە31، سالی7، کـوردسـتـان ـ سلێمانی، نیسانی1998، ل21.

13/ با خۆمان چاک بناسین، بەربانگ، ژمارە 108، سالی 16، سوید، 1998،ل27

14/ سێ سەرنجی زمانەوایی، مانگنامەی پەیام، ژمارە8، پووشپەڕ1998، ل18

15/ مـافی دیاریکردنی چارەنووس، گـۆڤـاری ئالا، ئۆرگـانی پارتی سـەربەخـۆیی کوردستان، ژمارە30، ڕێبەندانی1998، ل7.

نامیلکه و پەرتووک :

1 / دەربارەی پرۆژەکەی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، چاپی یەکەم، چاپخانەی مەڵبەندی رۆشنبیری کوردی، سوید، 1994، ل32

2/ دوا پرۆژە، چاپی یەکەم، چاپخانەی مەڵبەندی رۆشنبیری کوردی، سوید،1994، ل11

3/ پێنج ووتاری غەمگین، چاپخانەی باران، سوید،1994، ل77

4/ دیموکراسی، ئایدۆلۆژی و جەنگی نێوخۆ، چاپخانەی باران، سوید، 1994، ل84

5/ ملمـلانێی ئایدۆلۆژی لە کوردستاندا، چاپی یەکەم، سولەیمانی،1993، ل208.
چاپی دووەم، لە بڵاوکراوەکانی کتێبی هەرزان، سوید،1995، ل125

6/ پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەددا، چاپی یەکەم، چاپخانەی باران، سوید، 1996، ل91. چاپی دووەم، کوردستان، 1996.

7/ نامەیەکی درێژ بۆ نەوشیروان مستەفا، چاپخانەی باران، سوید، 1995، ل47

8/ کورد و شۆرش و هەلی مێژوویی، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی کیتاب هەرزان، سوید ـ یۆنشۆپینگ، 1996، ل222.

9/ فیدرالیزم و دەوڵەتی فیدراڵ، چاپی یەکەم، چاپخانەی باران، سوید، 1996 ،ل98. چاپی دووەم، لە بڵاوکراوەکانی دیموکراسی، کوردستان ـ سولەیمانی، 1996 ،ل90

10/ بەڵێ لێکۆڵینەوە و رەخنە نەک شێواندنی راستیی، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی کیتاب هەرزان، سوید،1996، ل53

11/ خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا، دەقی چاوپێکەوتن و دەمەتەقێیەک لەگەڵ جەرجیس فەتحوڵڵای پارێزەردا، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاپێک، ستۆکهۆلم، 1997، ل126 .

12/ رۆڵی سیستێمی بنەماڵە لە بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا، چاپی یەکەم، چاپخانەی میدیا، سوید ـ ستۆکهۆلم، 1997، ل100

13/ گیروگرفتە سەرەکییەکانی کورد، لە بڵاوکراوەکانی کیتاب هەرزان، سوید ـ یۆنشۆپینگ، 1998، ل80.

14/ ئۆجەلان ئەزموونێکی نوێ و پەندی مێژوویی، چاپی یەکە، چاپخانەی میدیا، سوید ـ ستۆکهۆلم، 1999، ل104.

# نـــــــاوەڕۆک

کێ دەتوانێ، ئەو چوار ساڵە وشکە، پڕ لە دڵکوداڵە مەترسییەی جەنگی نێوخۆ، لە بیر خۆی بەرێتەوە؟ کێ دەتوانێ، چاو لەو چوار ساڵە، پڕ لە قاتوقڕیی، بەڵا و نەگبەتییە بپۆشێ؟ کێ دەتوانێ، دیمەنی ئەو جۆگە سوورە خوێناوییەی ڕۆڵەکانی کورد، لە بیر و هۆشیدا بسڕێتەوە؟ کێ دەتوانێ، ئەو مێژووە ڕەشە بکوژێنێتەوە؟ کێ دەتوانێ، ناپاکیی سەرانی پارتی و یەکێتی لە یادبکا؟ گریمان، هەموو ئەوانەشمان فەرامۆشکرد، ئای کێ دەزانێ، لە ئایندەیەکی نزیکدا چی دیکە ڕوودەدا؟ بۆیە نابێ، هەرگیز ناخۆشیی و کارەساتەکانی جەنگی نێوخۆمان بیرچێتەوە. هەموو کاتێ دەبێ، لە ڕۆژانی خۆشیی، سەرکەوتن و ئاشتیدا، ناخۆشیی و کارەساتەکانمان لە بەرچاوبێ، تا خۆشیی و سەرکەوتنەکانمان لێ تێکنەچێ. لە هەمان کاتیشدا دەبێ، لە ڕۆژانی ناخۆشیی و تەنگانەدا، هەرگیز ورە بەرنەدەین، ڕەشبین نەبین، بۆ ئاسۆیەکی گەش و پرشنگدار بڕوانین، بۆ ئەوەی بە سەر ناخۆشیی و گرفتەکاندا سەرکەوین. هەروەها نابێ، هێندەش باسی ناخۆشیی بکەین، ورەی ڕۆڵەکانی گەل بڕوخێنین. بۆیە دەبێ، لە ئاشتیدا ڕۆژە سەختەکانی جەنگمان لە یادبێ، لە کاتی جەنگیشدا، ئاشتیی باوەڕ و هیوامان بێ!

---

# OJALAN, A NEW EXPERIMENT AND HISTORICAL LESSON

BY

Dr. HUSSEIN M. AZIZ

1999 (2698K)